# مەسیحیەت چییە؟

نوسینی: د.میللەر

وەرگێڕانی: ڕیدین عطار





# ﴿پێرست﴾

-مەراسیمە پیرۆزەکان

- هاوسەرگیری

**بەشی چواردەیەم: فێرکارییە ئەخلاقییەکانی مەسیحیەت کامانەن؟**

**بەشی پانزەیەم: بیروباوەڕی مەسیحییەکان لـە بارەی داهاتووەوە چییە؟**

-گەڕانەوەی عیسای مەسیح

-هەستانەوەی گشتی

-دادوەری کردنی کۆتایی

-بەهەشت و جەهەنەم

-مەرگی باوەڕداران

***کۆتایی**

## پێشەکی نوسەر

### هاوڕێی خۆشەویستم

هیوادارم بە جەستە و بە ڕۆح سەرکەیف و ساغ بیت، جوانترین سلاوی خۆمت پێشکەش دەکەم.

بوونی پەیوەندیی و هۆگرەتی بەتینی تۆ بۆ دەستخستنی ڕێنمایی و دۆزینەوەی هەقیقەت و هەوڵدانت بۆ پەیداکردنی ڕێگایەکی ڕاست و دروست،کە بە خواوەند و ڕزگاری ئەو کۆتایی پێ بێت، زۆر مایەی خۆشحاڵییە بۆمن.

لە ڕابردوودا زۆر پرسیارت لەوانەیە لەسەر بیروباوەڕیی مەسیحیەت هەبووبێت، خوێندنەوەی ئەم کتێبەش بۆخۆیی نیشانەی پەرۆشی تۆیە بۆ تێگەشتن، بەلام تا ئێستا دەرفەتی پێویست و بەسندە نەبووە تا هەموو ئەو زانیاریانەی لە گەڕان بۆ دۆزینەوەی ئەو پرسیارانە هەتان بووە لە گۆشەیەکدا بۆخۆتان جەم و جۆریکەن، هەر لەبەر ئەم هۆکارە بوو بڕیارم دا بە نوسینی ئەم نامە دورودرێژە، ئەو پرسیارانەی کە زۆرترین جار ئاڕاستەی ئێمەی مەسیحی کراوە، بە شێوەیەکی کورت و پوخت ئامادەی بکەم بۆ ئێوە و وە بە پێی توانا درێخی نەکەم لە وەڵامدانەوەیان، ئینجا ڕونی بکەمەوە کە باوەڕیی ئێمەی مەسیحی چییە، کار و ئەرکە ئاینییەکانمان کامانەن و ڕێوڕەسمەکانمان لەچی پێکهاتوون.

وەك دەزانن ئەمڕۆکە بە ملیۆنان مرۆڤ هەن لە سەراسای دنیادا، خۆیان بە مەسیحی دەزانن، هەندەك لەوانە باوەڕداریی ڕاستەقینەن و مخابن هەندێکیشیان تەنها بەناو و ڕوکەش مەسیحین، هەروەك چۆن زۆربەی ئاینەکانی تر لەناو خۆیاندا لقی تریان لێ بۆتەوە، لەنێو ئاینی مەسیحیشدا لە ڕوانگەی بیروباوەڕ و مەڕاسیمە پەرستشییەکان و...هتد جیاوازی هەیە و ئەم جیاوازیەش سەری لە جیابوونەوەی مەسیحییەکان لەیەکتری دەرکردووە و بۆتە هۆی دروست بوونی لق و دەستەیی جۆراوجۆر، کەواتە کارێکی دژوار و سەختە من بتوانم لەناو ئەم نامەدا و لە نێوەندی ئەم چەند پەڕە کەمەدا، بیروباوەڕی تەواوی لق و دەستەکانی ئاینی مەسیح بەیان بکەم، یاخود شتێك بڵێم کە هەموو مەسیحییەکانی دونیا لەگەڵی هاوڕابن و مایەیی پەسەندیان بێت.

ئەمـما خاترجەمم کە ملیۆنەها مەسیحی لە تەواوی شوێنە جیاوازەکانی دونیادا هەن، لەگەڵ ئەو ڕاستیانەی کە لەم نامەدا ئێوەی خۆشەویست دەیخوێننەوە هاوڕان.

نزا دەکەم، ئێوە لە کاتی خوێندنەوەی وردیی ئەم نوسراوەدا، لە خوداوەند نزیکتر ببنەوە و ئەو زیاتر بناسن و بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە خۆشەویستی ئەوتان زیاتر بۆ دەربکەوێت، وە بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوانتر گوێڕایەڵی لێ بکەن و بیپەرستن.

لێرە بە دواوە هەموو هەوڵێکی خۆم دەدەم تا گرنگترین پرسیارەکان کە ئاڕاستەی مەسیحیەت دەکرێت یەك بە یەکیان وەلام بدەمەوە

## پێشەکی وەرگێڕ:

کتێبی (مەسیحییەت چیە؟) وەك لە ناوەکەیدا دەیبینین، بۆمان ڕوندەکاتەوە بە شێوەیەکی کورت و پوخت کە مەسیحییەت چییە و ئەو شتانە چین مەسیحییەکان باوەڕیان پێی هەیە، وە کتێبێکە زۆربەی ئەو پرسیارانە وەڵام دەداتەوە کە زۆرترین کات لەسەر بیروباوەڕیی مەسیحییەکان کراوە، یان زۆرجار ڕەخنەی توند گیراوە لە مەسیحییەکان لەسەریان، گیروگرفتی نێوان مەسیحیەکان و ئایندارەکانی تر (بە تایبەت ئیسلام و یەهودییەت) ڕەگوڕیشەیەکی دێرین و لە مێژینەی هەیە، و کێشەی یەهودییەکان لەگەڵ مەسیحیەکان بەنمونە: دەگەڕێتەوە بۆ یەکەم ساتی بەرکەوتنی عیسا لەگەڵ یەهودییەکان، بە وشەکانی و بەو ڕەخنانەی کە عیسای مەسیح لە یەهودییەکانی دەگرت، بە تایبەت کاربەدەستانی یەهودی ئەوکات.

ئەم کتێبە لەلایەن کەسایەتییەکی متمانە پێکراوی کڵێسای (پریزبیتێر)ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە نوسراوە بە ناوی (دکتۆر ویلیام میللەر) کە ئاگاداری و شارەزاییەکی زۆری لە ئاینی مەسیحیەتدا هەیە و ناوبراویش خۆی یەکێکە لە باوەڕداران بە مەسیح، وەك مزگێنی دەری ئاینی مەسیحیش سەردانی چەندین وڵاتی جیهانی کردووە، لەنێو ئەو وڵاتانەشدا (ئێران و عێراق)هەن، لێرەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە ئێمە مەسیحیەت لە ڕوانگەی مەسیحییەکەوە دەناسین لەم کتێبەدا و ئەمەش هەواڵێکی باشە! لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم: کتێبی وەها کەمە لە کتێبخانەی کوردیدا کە ڕەخنە نەبێت لە مەسیحیەت و تایبەت لەسەر مەسیحیەت(بیروباوەڕیی بنچینەی مەسیحییەت) نوسرابێت بەم شێوە کورت و پوختە.

دووەمیش: گەربمانەوێت لە ئاینێك تێبگەین (وەك خۆی چۆنە ئاوها) ئەوا پرسیار لە ئایندارەکانی ئەو ئاینە دەبێ بکەین و سەیری هەڵسوکەوت و ڕسوم و نوێژ و ...هتد ئەو ئایندارانە دەبێ بکەین کە باوەڕیان بەو ئاینە هەیە، نەك بچین لە ڕوانگەی کەسیانی ترەوە کە سەر بەو ئاینە نین زانیاری وەرگرین، لەبەر ئەوەی ئاینەکان کەم و زۆر هەریەکە بە پێی باوەڕ و پێشینەی خۆی تەك یەکتریدا، هەرگیز دانی خێر بە یەکدا نانێن و هەریەکەیان و بە شێوەیەك دەیەوێت ئەوی تر لاوازبکات و بیروباوەڕی خۆی ساغ بکاتەوە.

بۆ تێگەشتنی ڕاست و دوروست و سەرەتایش لە ئاینی مەسیح، ئەم کتێبە یارمەتی دەرێکی ڕاستگۆ و باش دەبێت و لە کۆتایدا ئەو هەقە بەخۆم دەدەم کە بڵێم ئەم کتێبە یەکێکە لە باشترین و کورت و پوخت ترین کتێبانێك کە تا ئێستا لەسەر مەسیحییەت بەرچاوم کەوتووە یەکێکە لەو کتێبانەی کە بە جوانی وخەمخۆرییەوە لەم مەودا کەمەی لاپەڕەدا توانیویەتی بڕێکی زۆر لە پرسیارە گرنگ بەشێوەیەکی تەواو شیرین و ڕەوان وەڵام بداتەوە. لێرە بەدوا زیاتر لەسەر ئەم کتێبە قسەناکەم و هیوادارم کەمترین هەڵەم لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا کردبێت، بەو شێوەیەی کە دکتۆر میللەر ئامادەی کردووە توانیبێتم بیگوازمەوە بۆ خوێنەری کورد زمان.

(بەشی یەکەم)

# خودای مەسیحییەکان کێیە؟

**هاورێی هێژام**

**باوەڕم وایە یەکەمین پرسیاری تۆ بۆ مەسیحییەکان ئەوەیە کە "ئایا مەسیحییەکان لە بارەی خوداوە چ بیروبڕوایەکیان هەیە؟ وە کام خودا دەپەرستن؟" جا ئەمەش هەر لە خۆوە ناڵێم، چوون جگە لەوەی ئەو پرسیارە زۆرترین کات ڕووبەڕوومان کراوەتەوە، گرنگترین پرسیاریشە لە هەر ئایندارێك بکرێت بۆ تێگەشتنی زیاتر لەئاینەکەی.**

**دەزانم مرۆڤگەلی نابەرپرسیار و بێ ئەزموون بە تۆیان وتووە مەسیحییەکان "سێ خودا دەپەرستن!" تەنانەت هەندێ کەس تائێستاش وادەزانن کە ئێمە خاچ و وێنە و پەیکەر و ...هتد دەپەرستین و هانایان بۆ دەبەین، یان بە "خاچ پەرست!" ناومان، هەر لە سەرەتای باسەکەمانەوە با ئەوەت لا ڕوون بێت کە ئەو قسانە تەواو دوورن لە ڕاستیەوە، ئەو کەسانە بە هەڵەداچوون کەوا سەبارەت بە بیروباوەڕی شوێنکەوتوانی ئەم ئایینە بەخواوەند دەدوێن، جا بەهۆی بیری وشکی مەزهەبیەوە بێت یان بەهۆی کەم خوێندنەوە بێت لەسەر ئاینی مەسیح یان بە هەر هۆکارێکی تر بێت.**

**لە ڕاستیدا مەسیحییەکان ئیمانێکی بتەویان بەخودای تاك و تەنها هەیە و ئەگەریش لێرە و لەوێ_کە شتی لەو شێوەیە زۆر کەمە_ مەسیحییەك هەبێت خودایەکی تر بپەرستێت یان هانا وەبەر شتێکی تر ببات جگە لە خودای بەهەق و تەنها، ئەوا بێگومان گەورەترین هەڵەی کردووە.**

**بنوارە... عیسای مەسیح کاتێك لێیان پرسی گەورەترین و گرنگترین ڕاسپاردە چییە؟ بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە: "خودای ئێمە یەك خواوەندە، جا دەبێت خودات خۆش بوێ لە ناخی دڵەوە، بەهەموو گیان و بەهەموو بیر و بەهەموو تواناتەوە.."[1]**

**لای زۆربەمان ڕوونە کە پەیامی هەموو پەیامهێنەرانی پێش عیسا، بانگەشە بووە بۆ یەك خوداپەرستی و هەموویان ئەوەیان بەیان کردووە کە خودا تاك و تەنها و حەقە، پەیامی عیسای مەسیحیش بەهەمان شێوەیە، وەك لە نمونەکەی سەرەوە ئاماژمان پێدا.**

**جا باڕوون بێت لات، مەسیحییەکان باوەڕیان بەخودایەك هەیە، کە نەسەرەتایەکی هەیە و نە کۆتاییەك، خودای مەسیحییەکان ئەزەلی و ئەبەدییە، ئێمە باوەڕمان بە خودایەك هەیە، کە ئاگاداری ورد و درشتی هەموو شتێکە، فەرمانڕەوا**

---

[1]﴿مەرقۆس29/12﴾

**و گەورەی تەواوی بوونەوەرەکانە، هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە دەبینرێن و نابینرێن لەلایەن ئێمەوە، بە وشەی[2] ئەو ئافراون.[3]**

**ئەگەر کەسێك چاوێکی ڕاستەقینە بە خۆر، مانگ، ئەستێرە، دروستکراو و بەدیهێنراوە لەژمارەنەهاتووەکانی خودایا بخشێنێت و لێیان وردببێتەوە، ئەوا شکۆ و گەورەی ئەو خودایەیان بۆ دەردەکەوێت و هەروەك داودی پەیامهێن دەڵێن: "ئاسمان باسی شکۆداری خودا دەکات، دەسەڵاتی خواوەندمان پێ نیشان دەدات، فەلەك لەشوێن دەستی وی خەبەردارمان دەکات.."[4]**

**حیکمەت و مەزنیی خودای ئێمە چەندە زۆرە کە نەك تەنها کاکێشانەکانی لەبۆشاییەکی بێ بڕانەوەدا ئافراندووە بەو گەورەیی و فراوانیەیانەوە، بەڵکی بچوکترین و جوانترین گوڵەکانیشی لەزەویدا ئافراندووە و سەرەرای ئەوەش، دەیانپارێزێت و ئەمە لە مەزنی ئەوەوەیە کە پارێزەر و بەرێوەبەری ورد و درشتی دروستکراوەکانە.**

**خودا لەئایینی مەسیحیدا باڵادەستیەکی ڕەهای هەیە، دەتوانێت هەرچیەك کە دەیەوێت ئەنجامی بدات، ئەو بۆ ئەم جیهانە نەخشە و وێنەیەکی مەوژ کردووە، کە هیچ شتێك بێ بەرنامە نییە و لەخۆوە ناڕوات بەرێوە و هەمووی بە ئەندازەیەکی وردو جوان نەخشاندووە. خودان لای ئێمە بەدەسەڵات و گەورەیە و لەهەمان کاتدا پیرۆز و دادپەروەرە، ئەم دەسەڵات و گەورەیەی خۆی لەدادپەروەری و فەراهەم کردنی یەکسانیدا بەکار دەبات.**

**لە دێرزەماندا یۆنانییەکان، خەسڵەتی زۆرترسناك و ئابڕووبەریان دەدایە پاڵ خواوەندەکانی خۆیان، ئەوان فرەخوابوون و خواوەندانی جۆراوجۆریان دەپەرست، خواوەندانی ئەوان، بە وتەی خۆیان کاری بەد و درۆ و داوێنپیسی ودزی وکوشتنی ناهەقیان ئەنجام دەدا. بەپێچەوانەی ئەمانەوە، لەکتێبی پیرۆزی مەسیحییەکاندا، دەربارەی پیرۆزی و پاکی و بێ وێنەی تەواوەتی خودا، ئاماژەگەلی فرەوفراوان خراوەنەتە ڕوو کراوە، کە بوونی خودا لەهەر جۆرە ناپاکی و شتێکی خراپ بەدوور دەگرێت و لێی بێ بەری دەکات.**

**یەکێ لەخزمەتکارانی ڕاستەقینە و خۆتەرخانکردوو بۆ خودا، لەخەودا بوونەوەرانی ئاسمانیی بینی کە لەحزووری خوادا بوون و ئەویان ستایش دەکرد و دەیان وت:**

**"پیرۆز...پیرۆز...پیرۆز، ئەی خواوەندی بەدەسەڵاتی ڕەها"[5]**

---

[2] Word

[3](لەسەرەتادا وشە هەبوو، وشەکە لای خودابوو، هەموو شتێك بەو بەدی هاتووە، بێ ئەو هیچ شتێك بەدی نەدەهات لەوانەی کەدەبینرێن و نابینرێن لە بەدیهێنراوان) ﴿یۆحەنا**1/1**تا**5**﴾

[4](ئاسمان باسی شکۆی خواوەند ئەکات...گەردوون کارەکانی دەستی ڕادەگەیەنێت...ڕۆژ لەدوای ڕۆژ وتەی بەرز ڕادەگەیەنێت...شەو لەدوای شەو زانین ڕادەگەیەنێت...هیچ قسە وزمانێکیان نییە...دەنگیان نابیسترێ...بەڵام پەیامیان دەگاتە هەموو گۆی زەوی و وتەکانیان بەهەموو جیهان) ﴿زەبوری**1/19**تا**5**﴾

[5](پاش ئەوە تەماشام کرد دەرگایەکی کراوەم بینی لەئاسماندا، ئەو دەنگەش کەیەکەم جار وەك کەڕەننا هاتە گوێم، پێی فەرمووم: سەربکەوە بۆ ئێرە، ئەوەت پیشان دەدەم کەدوای ئەمە پێویستە ڕووبدات. دەست بەجێ ڕۆحی پیرۆز هاتە سەر و تەختێکم بینی لەئاسمان دانرابوو، لەسەر تەختەکەش یەکێك دانیشتبوو، ڕوخساری

**ئەگەر چی هەموو شتەکان لەدەستی خودا دایە و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت، بەڵام ناتوانێت کارێك کە پێچەوانەی پیرۆزی و قەدیسی خۆی بێت ئەنجامی بدات، بۆنموونە خودا ناتوانێت درۆبکات، یان کردەوەیەکی نادادپەروەرانە ئەنجام بدات. خواوەند لای ئێمە بوونێکی ماددیی نییە و بەکات و جێگایەکی دیاری کراوەوە سنوردارنەکراوە و ناشکرێت، بەڵکو هەمیشەییە، لەهەموو شوێنێکیش کە ئێمە بە بیرماندابێت و نەیەت ئامادەگی هەیە. ڕاستە هەندێ کات ئێمە لە "دەست و چاو و دڵ و..هتد"ی خودا دەدوێین بەڵام ئەو دەستەواژە وێنەدار و شکڵ بەخشانە بە خودا بۆ بەیانکردنی هەندێ لە مەبەستە ڕۆحانی و مەعنەوییەکان بەکاردەهێنین تا تێگەشتن ئاسان بێت نەك شتێکی تر.**

**زۆرکات دەڵێین خودا لە ئاسمانە و بەدەسەڵاتە و لە ئێمە زۆر باڵاترە، ئەمە بەو مانایە نایەت بە بچووك سەیریمان بکات و ئێمەی بەلاوە گرنگ نەبێت، نەخێر ئەو بەمیهری خۆی هەمیشە لە خەمی ئێمە دایە و ئاگای لێمانە، نزیکە لێمان...نزیکایەتیەك وەك ئەوەی لەنێو دڵماندا خۆی بەرقەرارکردبێت.**

**تەواوی خەسڵەتەکانی خودا گرنگییەکی تایبەتی هەیە بۆمان، ئێمەی مەسیحی سپاسگوزارین خواوەندێك پەرستش دەکەین کە خواوەندی خۆشەویستییە. هەروەك لەکتێبی پیرۆزدا ئاماژەی پێ کراوە و نوسراوە کە:**

**"خواوەند خۆشەویستییە.."**[6]

**واتە هەرچییەك کە خودای ئێمە فەرمانی لەسەر دەردەکات و قەراری لێ دەدات لەخۆشەویستیەوەیە. خودا خۆشەویستی خۆی بەهەموو جۆرێکی مرۆڤ دەبەخشێت بەتەواوی جیاوازییەکانەوە، ئەو باران لە ئاسمانەوە و خۆراك لە زەویەوە بەبوونەوەران دەبەخشێت، بێ ئەوەی لێیان بپرسێت چۆنن و چین و کێن، هەموو شتێکی بۆ بوونەوەران فەراهەم کردووە کە پێویستیانە بۆ ژیان. جگە لەمانەش خودا بەناردنی پەیامهێنەران زیاتر خۆشەویستی خۆی بۆ ئێمە نیشاندا و لە ڕێگای ئەوانەوە زیاتری دەربارەی خۆی پێ فەرمووین، پەیامهێنەرانی نارد تا ڕێنوێنیمان بکەن لەم دوونیا پڕلە کێشە و گرفت و ناخۆشیەدا.**

**یەکێ لە گەورەترین بەخشینەکانی خودا دەرهەق بە ئێمە، ناردنی ڕزگاریکارێك بوو کەلەدوایدا بەوردی باسی ئەو**

---

دانیشتووەکە لە بەردی یەشب  و یاقوتی سوور دەچوو، پەلکە زێڕینەیەکیش وەك زمرود لەدەوری تەختەکە دەدرەوشایەوە، لەدەوری ئەو تەختەیەش 24تەختی تر هەبوون 24پیریش کە جلکی سپیان پۆشیبوو لەسەر تەختەکان دانیشتبوون و تاجی زێڕینیان لەسەربوو، لەلای تەختەکەوە دەنگی هەورەبروسکە و هەورەگرمە دەهات، لەبردەم تەختەکەش حەوت چرای ئاگرین ئەسوتان کە حەوت ڕۆحەکەی خودان، لەبەردەم تەختەکەش شوێنێکی وەك دەریایی شوشەیی هەبوو، وەك کریستاڵ. لەناوەڕاست، لەدەوروبەری تەختەکە چوار بوونەوەر هەبوون، لەپێش و پاش بەچاو داپۆشرابوون، بوونەوەری یەکەم وەك شێربوو، دووەم بونەوەر وەك جوانەگا، سێیەم بوونەوەر ڕوخسارێکی وەك مرۆڤی هەبوو، چوارەم بوونەوەر چەشنی هەڵۆ بوو، ئەم چوار بوونەوەرە هەریەکەیان شەش باڵی هەبوو، دەوروبەرو ژێر باڵیشیان بەچاو داپۆشرابوو، تەنانەت لەژێر باڵەکانی، شەو ڕۆژ بێ وەستان دەڵێن: پیرۆزە..پیرۆزە..پیرۆزە، خودای پەروەردگاری هەرە بەتوانا، ئەوەی هەبووە و هەیە و دێت)

﴿ئاشکراکردن**4**/**1**تا**9**﴾

[6] ﴿یۆحەنا**4**/**1**تا**8**﴾

**ڕزگاریکارە مەزنە دەکەین.**

**ئەوەی گرنگە بوترێت ئێستا، ئەوەیە کە خودا تەواوی ئەو کەسانەی ئافراندوونی خۆشەویستی هەیە بۆیان، هەموو کات و ساتێك بۆ وان باشی و سەلامەتی مەبەستە. داودی پەیامهێن ڕێنوێنی خواوەندی دەرهەق بەخۆی لەناو ئەم وشە بەپێز و شیرینەدا بەیان ئەکات و ئەفەرموێت:**

**"خواوەند هەموو کات چاودێری منە..."[7]**

**شتێکی ئاشکرایە کە خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت و گوێڕایەڵی فەرمایشتەکانی دەکەن، بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە"ئایا ئەوانەشی خۆش ئەوێت و میهرەبانی هەیە بەرامبەریان، کە پشتی لێ دەکەن و گوێڕایەڵی لە فەرمایشتەکانی ناکەن و ئەویان خۆش ناوێت؟"**

**بێ شك خودا لای ئێمەی مەسیحی پیرۆزە و هەرجۆرە کارێکی دروست کە مرۆڤەکان ئەنجامی بدەن پێی باشە و وەبەپێچەوانەشەوە لە هەر بەدکرداریەك بە نەفرەتە، بەم پێیە کاتێك کە مرۆڤەکان بەدکرداری ئەنجام دەدەن خۆیان وەبەر سزای خودا دەدەن، خوداش لە هەمبەر بەدکرداران و خراپەکاراندا بەسزایە، لەم بارەوە داودی پەیامهێن فەرمووی:**

**"هەموو بێهوودەکەرەکان و بەدکارەکان بەنەفرەت دەکات.."[8]**

**کەوابوو خودا سزای ئامادەکردووە بۆ ئەو کەسانەی بەدکردارن و بایسی نارەحەتین بۆ مرۆڤگەلی بێ تاوان و گویڕایەڵی لە فەرمانەکانی ئەو ناکەن. کاتێ کە کتێبی پیرۆز دەخوێنینەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خودا چۆن ئەو کەسایەتی و میللەتانەی سەرپێچیان لە فەرمایشتەکانی ئەو کردووە و تۆبەیان نەکردووە و پەژیوان نەبوونەتەوە لە تاوانەکانیان، سزای داون و تەفروتونایانی کردووە.**

**بەڵام هاوڕێی بەنرخم..**

**ڕێگام بدە کە لێرەدا هەقیقەتێکی بە بەها و جوانت بۆ بخەمە ڕوو:**

**پێشتر وتم کە خودا لە هەمبەر تاوانباران و بەدکرداراندا بەم شێوەیەیە، بەڵام سەرەڕای ئەوە، خودا لە بەرامبەر خراپەکاراندا دەرگای لێخۆشبوونی دانەخستووە و دەیەوێت لە هەر هەلێکدا بێت لێیان خۆش بێت و لە دەمی ئەوانی ببیستێت کە لە تاوانەکانیان پەژیوانن و لە ڕەفتاری ئەوانی ببینێت کە بەڕاستی دەیانەوێت لێخۆشبوون و ڕزگاری بەدەست بهێنن، واتە خودا سزای بۆ تاوانباران داناوە، بەڵام ئەو سزایە مرۆڤ بۆ خۆی هەڵیبژاردووە و سەرکێشی دەکات،**

---

[7](یەزدان چاودێری منە هەمووکات، یەزدان شوانی منە و پێویستم بەهیچی تر نییە، لەلەوەڕگای سەوزدا دەملەوەڕێنێت و دەمباتە سەر ئاوی سازگار، گیانم دەبووژێنێتەوە، بەرەو ڕێگای ڕاست و دروستی ڕێنمایم دەکات، لەپێناو ناوی خۆی، ئەگەر تەنانەت بەنێو دۆڵی سێبەر و مەرگیشدا بڕۆم، لەهیچ خراپەیەك ناترسم، لەبەرئەوەی تۆلەگەڵمدایت، گۆچان و دارەدەستەکەت دڵنەوایم دەکات) ﴿زەبووری**23/1**تا**5**﴾

[8](تۆ خودایەك نیت خراپەت پێخۆش بێت، بەدکردار لەگەڵت نیشتەجێ نابێت، لوتبەرزەکان لەبەرچاوت بێزراون، ڕقت لەهەموو بەدکارێك دەبێتەوە، ئەوانەی بەدرۆ قسە ئەکەن تۆ لەناویان ئەبەیت، یەزدانم قێزی لە کەسی خوێن ڕێژ و فێڵباز دەبێتەوە) ﴿زەبووری**5/4**تا**7**﴾

ئەگینا خوداوەند هەرگیز نایەوێت هیچ مرۆڤێك ئازار و ئاسیو بخوات، خۆشی دەوێن! دەرگای خۆشەویستی خۆی لەسەر ئەوانەش دانەخستووە کە تاوانکارن، خۆشی دەوێن وەك باوکێك چۆن ڕۆڵەکەی خۆی خۆش دەوێت، لێرەدا بە نموونەیەك ئەم خۆشەویستیەی خودا بۆ سەرپێچیکاران ڕوون دەکەمەوە کە لە کتێبی پیرۆز(ئینجیل)دا نوسراوە.

لە کتێبی پیرۆز دا عیسای مەسیح ئەم نمونەیە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

" کابرایەك دووکوڕی هەبوو، یەکێ لەکوڕەکانی بەباوکی وت: باوکە چیم بەردەکەوێت لە بەشی خۆم لای تۆ بمدەرێ، باوکەش چی سامانی هەبوو کردی بەدووبەشەوە و بەشێکی تەواوی پێ دا، دوای چەند ڕۆژێك کوڕی بچووك چی هەبوو هەمووی کۆکردەوە، ئینجا کەوتە ڕێ بۆشوێنێکی دوور، لەو شوێنەی کەبۆی چووبوو، چی هەبوو هەمووی لە ڕابواردن خەرج کرد. کاتێ کوڕە هیچی بەدەستەوە نەما، گرانی کەوتە ئەوناوچەیە، ئینجا هەستی بەوەکرد کە پێویستی بەشتێك هەیە پێی بژی، چووە لای کابرایەك لە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە، کابرا وەری گرت و ناردی بۆکێڵگەکەی خۆی تاوەکو بەرازەکانی بۆ بلەوەڕێنێت، برسێتی وای لەو کوڕە کرد کە حەزی دەکرد لەخرنوکی بەرازەکان بخوات، بەڵام تەنانەت ئەوەشی دەست نەدەکەوت. ئینجا بیری کردەوە و وتی: ئاخۆ چەندە نان بمێنێتەوە ئێستا لەبەر ئەو کەسانەی لای باوکم ئیش دەکەن و سەیرکە منیش لێرەدا چۆن گیرم خواردووە و خەریکم دەمرم لەبرساندا. پەشیمانی دای گرت و وتی: بابگەڕێمەوە بۆلای باوکم و کە چوومەوە لای دەڵێم بابە گیان من بەرامبەر بەئاسمان و بەرامبەر بەتۆ هەڵەم کرد. ئیتر شایەنی ئەوە نیم بەکوڕی تۆ یان ڕۆڵەی تۆ بانگ بکرێم، تەنها بمکە بەیەکێك لە کرێکارەکانی خۆت...ئەوسا کوڕە هەستا و گەڕایەوە بۆلای باوکی کاتێك باوکی لە دوورەوە کوڕەی هەڵەشە و هەڵەکاری خۆی بینی کە بەو شێوەیە داڕوخاوە، ڕای کرد بەرەوپیری و دڵی زۆر بۆی سووتا و دەستی کردە ملی و ماچی کرد. کوڕە وتی بە باوکی خۆی: بابە گیان من بەرامبەر بە ئاسمان و بەرامبەر بە تۆ هەڵەم کرد، ئیتر من شایەنی ئەوە نیم بەکوڕ و ڕۆڵەی تۆ بانگ بکرێم...بەڵام باوکە بانگی بەردەستەکانی کرد و وتی: بڕۆن خێرا باشترین جل و بەرگ و بۆ ڕۆڵەکەم بێنن و لەبەری بکەن، ئەنگوستیلەی لە پەنجان بکەن و پێڵاوی باش بکەنە پێی، گوێرەکەیەکیش بهێنن و سەری ببڕن تا بیخۆین و ئاهەنگ بگێڕین بەبۆنەی هاتنەوەی ڕۆڵەکەم.."[9]

جا لەبەر ڕۆشنای ئەم نموونە بەنرخەی کتێبی پیرۆزدا، دەمەوێت بڵێم کە باوکی ئاسمانیمان(خودا)، لە شێوەی ئەو باوکەدایە بەرامبەر بەکوڕە هەڵەکارەکەی بەخشندە و سازگاربوو، سەرەڕای هەڵەی ڕۆڵەکەی، وە هەمیشە دەیەوێت لە تاوانەکانمان خۆش ببێت بەمەرجێك ئێمە هانای بۆ ببەین و داوای لێخۆشبوون و ڕزگاری لێ بکەین بەڕاستی.

هاوڕێی هێژام...زانینی ئەوەی کە خودا بەگەورەی خۆی ئێمەی خۆش دەوێت و هەمیشە دەیەوێت لە باشی و ئارامیدا بین و ئامادەیە هەموو کاتێك تەوبەکانمان لێ وەرگبرێت هەواڵێکی زۆر باشە و مایەی دڵخۆشییە، بەتایبەت کاتێ کە ئێمە

[9]﴿لۆقا15/11تا24﴾

**لە ڕۆژگارێکدا دەژین لە هەموو لایەکەوە بەکێشەو گرفت و تاوانکاری دەوردراوین.**

**لەکتێبی پیرۆزدا، ناو و ناونیشانی زۆر و زەوەند بۆ خودا یان بۆ ئاماژەکردن بە خەسڵەتەکانی خودا بەکارهاتووە تا ئێمە باشتر ئەو بناسین، بۆ نموونە:**

**-مەزن**[10]

**-خاوەن دەسەڵات و سەروەر**[11]

**-یەهوە/خودان**[12]

**-هەمیشەی/ئەزەلی و ئەبەدی**[13]

**-زیندوو/حەی**[14]

**-پیرۆز**[15]

**-دروست و حەق**[16]

**-پادشا**[17]

**-دادگەر**[18]

**-دروستکار/خالق**[19]

**-ڕزگارکەر**[20]

**بەڵام ئەو ناوەی کە ئێمەی مەسیحی زۆرتر لەهەموویان دڵگیرترە بەلامانەوە و زیاتر لەهەموو ناوەکانی تر بۆخودا بەکاری دەبەین، ناوی(باوکی ئاسمان)ـی یە، کاتێك عیسای مەسیح دەربارەی خودا قسەی دەکرد، بە زۆری ئەوی بە (باوکی من) ناودەبرد و بە شاگردانیشی دەفەرموو کە کاتێ نزا دەکەن بڵێن:**

---

The Almighty[10]
The Lord[11]
Jehovah[12]
The Everlasting[13]
The Living[14]
The Holy one[15]
The righteous[16]
The King[17]
The Judge[18]
The Creator[19]
The Savoir[20]

**" ئەی باوکمان لـە ئاسمان، ناوی تۆ پیرۆزبێت.."[21]**

**جا ئیتر لـەم هەواڵـە باشتر و مایەی دڵـخۆشی تر هەیە کە ڕۆڵـەی ڕۆحانی خواوەندێکی نەبڕاوە و بەدەسەڵات بین و بزانین کە خوای گەورە باوکی پڕ لـە میهر و خۆشەویستی ئێمەیە؟ ئەم شکۆمەندییە گەورەیە لـە ڕێگای خوداوە هەموو ئەوکەسانەی لێ بەهرەوەر دەبێ کە بە عیسای مەسیح باوەڕ دەهێنن و ڕزگاری لـە ئەو دەخوازن.**

**لـە کاتی خوێندنەوەی ئەم نوسراوەدا تا ئێرە، لـەوانەیە زۆر پرسیار لات درووست بووبێت، لـەسەر هەندێ شت و وابزانیت کە هەروا بەسەریدا دەچین و وەڵامی نادەینەوە، بەڵام ئەرخەیان بە کە تەواوی ئەو پرسیارانەی لای تۆ دروست بووە، لـێرەوە وەڵامی دەدەینەوە، ئەم بەشە کە لـەسەر پرسیاری(خودا کێیە؟) بوو لـێرەدا بەکۆتا گەیشت، لـە بەشەکانی تردا بە بەشێوەیەکی ئاسان، بۆ ئەوەی تۆ تێبگەیت پرسیارگەلی وەك (سیانەکی پیرۆز Holy Trinity)[22]چییە لـەلای مەسیحییەکان و زۆرشتی تر دەخەینە بەر باس خودا یار بێت.**

[21](باوکمان لە ئاسمان، ناوی تۆ پیرۆز بێت_واتە: شکۆدارکردنی خواوەند لەلایەن بەدیهێنراوەکانی_، پادشایەتی تۆبێت_واتە: هاتنی پادشایەتی خودا لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەمین_، ویستت لەسەر ڕووی زەمین پەیڕەوبکرێت وەك لە ئاسمان، نانی ڕۆژانەمان ئەمڕۆش بدەرێ، لە گوناهەکانمان خۆش ببە)﴿مەتا**9/6**تا**13**)

[22]واتە: باوك و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز

(بەشی دووەم)

# مــرۆڤ کێیە؟

**هاوڕێی هێژام**

**لە بەشی پێشتردا کورتەیەکم دەربارەی بیروباوەڕی مەسیحییەکان لە بارەی خوداوە باسکرد، ئێستا هەوڵدەدەم بیروبۆچوونی مەسیحییەکان لە بارەی مرۆڤ و سروشتی مرۆڤەوە بخەمە ڕوو کە چ بیرو بۆچوونێکیان هەیە.**

**بوونی زانیاری دروست لە بارەی مرۆڤەوە، بەهەمان ئەندازەی بوونی زانیاریەکی دروست لە بارەی خوداوە بۆ ئێمەی مەسیحی گرنگە، ئەڵبەتە زانیاری ئێمە لە بارەی مرۆڤیشەوە ڕاستەوخۆ وەرگیراوە لە کتێبی پیرۆزەوە.**

**لە سەرەتای کتێبی پیرۆزدا نوسراوە:**

**"کاتێك خواوەند دروستکردنی ئاسمان و زەوی و تەواوی ئاژەڵان و بوونەوەرانی تری بەکۆتا گەیاند ئەوکات کە هەموو شت ئامادەبوو مرۆڤی لەسەر شێوەی خۆی ئافراند"[23]**

**ئەڵبەتە ئەمە بەو مانایە نایەت کە خودا خاوەنی جەستەیەکی هاووێنەی ئێمەیە و جەستەی مرۆڤی وەك جەستەی خۆی ئافراندووە، بەڵکی مەبەست لەوەیە کە خودا ڕۆحی مرۆڤی هاووێنەی خۆی ئافراندووە، خودا ئاوەزی بەمرۆڤ بەخشی تا مرۆڤ بتوانێت لە بەڵگەکانی بوونی وی تێبگات و تێبفکرێ، ویژدانی بە مرۆڤ بەخشی تا بتوانێت چاکە و خراوەکان لە یەکتری جیابکاتەوە و نەبێتە بایسی ناسازگاری دروست کردن بۆخۆی و بۆ چواردەوری، ئیرادەی پێ بەخشی تا کارەکانی بەباشی ئەنجام بدات، زمانی پێ بەخشی تا بتوانێت قسە بکات، لە هەموو بەخشینەکانیشی گرنگتر ڕۆحە، کردگار ڕۆحی بەمرۆڤ بەخشی تا مرۆڤ بتوانێت لەو ڕێگەیەوە لەگەڵیدا هاودەم بێت هەمووکات و دۆستایەتی تەکدا بنوێنێ.**

**بەم وێنەیە خودا مرۆڤی لەسەر شێوەی خۆی ئافراند، بۆ ئەوەی مرۆڤ باشتر بتوانێت ئەو بناسێت و لەگەڵی هاودەمی**

---

[23](لە سەرەتادا خودائاسمان و زەوی بەدی هێنا، دواتر خواوەند فەرمووی باڕوناکی ببێت، ئینجا ڕووناکی بوو، دواتر خودا ڕوناکی لە تاریکی جیاکردەوە، ڕوناکی ناو نا ڕۆژ و تاریکی ناونا شەو، دواتر خودا فەرمووی با بۆشاییەك لەنێوان ئاوەکاندا دروست ببێ بۆ جیاکردنەوەی ئاو لە ئاو، دواتر بۆشایەکەی دروست کرد و ئاوەکەی ژێر بۆشاییەکە لە ئاوەکەی سەر بۆشاییە کراوەکە جیاکردەوە، خواوەند بۆشاییەکەی ناو نا ئاسمان، دواتر خواوەند فەرمووی با ئاوەکانی ژێر ئاسمان لە یەك شوێن کۆببنەوە و وشکانی دەربکەوێت، ئیتر وشکایشی ناو نا زەوی، ئاوە کۆبوەکەشی ناو نا دەریا، دواتر خودا فەرمووی بازەوی سەوزای بدات، زەویش سەوزای دا، دواتر خودا فەرمووی با لە ئاسمان ڕوناکییەکان هەبێت بۆ جیاکردنەوەی شەو لە ڕۆژ، ئیتر بۆ ئەوە مانگ و خۆریشی دروست کرد، دواتر خودا فەرمانیدا ئاوەکان و سەرزەوی پڕبن لە بوونەوەری جۆراو جۆر، زەوی و ئاوەکانیش پڕبوون، دواتر خودا جۆرەکانی جیاکردەوە لە ئاژەڵان و دوای دروست کردن و ڕێکخستنی هەموو شتێك و تەیارکردنی، خواوەند پشووی دا و مرۆڤی لەسەر شێوە خۆی بەدیهێنا)﴿پەیدابوون**1/1**تا**26**﴾_ئەمە کورت کراوەیەو بەشێوەیەکی زۆر ڕونتر و جوانتر لە کتێبی پیرۆزدا ئەم ڕووداوانە باس کراوە_

دروست بکات، کەوابوو مرۆڤ بە شەرەفمەندترین و ڕێزلێگیراوترین ئافریدەکراوی کردگاری جیهانیان دێتە هەژمار.

هەندێ گروپ هەن لەناو مەسیحیەکاندا دەڵێن: مرۆڤ لە سەرەتای درووست بوونیەوە پێش دەرکردنیان لە ئاسمان، هەر ئەسڵەن خودا بووە، ئەم ڕایە هەر لە نێو چەند گروپێکی کەمی مەسیحیەکاندا نییە بەڵکی لە دەرەوەی گروپە مەسیحیەکانیشدا هەیە، بەڵام ئەم قسانە تەواو هەڵەن و پشت ئەستور نین بەهیچ بەڵگەیەکی ڕوون و باوەڕپێکراو، ڕاستی کەلام ئەوەیە کە مرۆڤ لەوکاتدا زۆر لە خودا نزیك بووە و تەواو پاك بووە و لە هیچ تاوان و پیسیەکەوە نەگلاوە، وەك ئەمێستا ڕۆبۆت نەبووە، بەڵکو لەو کاتدا خواوەند ئیرادەی بەمرۆڤ بەخشیبوو، ئیرادەیەکی وەها کە ئازادانە هەقی هەڵبژاردنی هەبێت.

لە ڕاستیدا خودا مرۆڤی ئازادانە ئافراند تا بەمەیلی خۆی کردگاری خۆی گویرایەڵی بکات و خۆشەویستی و گوێ لە مشتی بۆ ئەو نیشانبدات، وەك چۆن ویستی خوداش وابوو کە تەواوی مرۆڤەکان لە جیهاندا خێزانی ڕۆحانی ئەو بن و ئەو وەك باوك خۆشەویستیان لەگەڵدا بنوێنێت. ئەمڕۆکە لەم جیهانە بەرفراوانەی ئێمەدا نەژادگەلی جۆراوجۆرمان هەیە، کە لەڕووی ڕەنگ و شکڵ و پێست و زمان و..هتد جیاوازیان هەیە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە هەموو مرۆڤەکان بە تەواوی جیاوازیەکانیانەوە لەیەك خوێنن و دەگەڕێنەوە سەر یەك خێزان و ماڵبات، بەم پێیە خودا کە دەلێین مرۆڤی خۆش دەوێت، ئیتر گشت مرۆڤێکمان مەبەستە، فەرق ناکات ڕەشە، سپییە، سوورە، یان لە چ تیرەیەکە و...هتد، هەرچۆنێك هەیە خۆشەویستی خودای بەر دەکەوێت چوون مرۆڤە. بەڵام بە داخەوە ئیرادە و مەیلی خودا بۆ مرۆڤ بە ئەنجام نەگەشت، مرۆڤ_لێرەدا مەبەستی لە مرۆڤ دایك و باوکی یەکەمینی مرۆڤە واتە: ئادەم وحەوا_لە بری ئەوەی ئەم خۆشگوزەرانی و ئازادیەیی خۆی لە شوێنێکی باشدا بۆ گوێڕایەڵی و خزمەتی کردگاری بەکاربێنێت، بە پێچەوانەوە بە شێوەیەك کە لە کتێبی پیرۆزدا باسکراوە[24] و ئاماژەی پێکراوە لەم کەماڵە بەرزەی خۆی بۆ سەرپێچی کردنی لە خواوەند و سوودی وەرگرت، خودا بەئادەم و حەوای فەرموو لە سەمەری تاکە درەختێك کە هەیە لە باخچەی عەدەندا (عەدەن ئەو جێگا بێوێنەیەی کردگار سەرەتا بۆمرۆڤی قەراریابوو)نەخۆن کە ئەویش بەری درەختی (زانینی چاکە و خراپە) بوو، چوون ئەگەر لێی بخۆن بە مردن دەمرن، جا دوای ئەوە شەیتان لەسەر شێوەی مار چووە نێو باغی عەدەن، حەوای ڕازی کرد کە لە بەری ئەو درەختە بخۆن، دواتر حەوا گوێڕایەڵی ویستی خراپی شەیتان بوو لە سەمەرەی درەختەکەی خوارد و بەشی ئادەمیشی لێدا و ئادەمیش بە هەمان شێوە لە بەری ئەو دارە قەدەغەکراوەی خوارد، ئەم کارەی دایك و باوکی سەرەتایی ئێمە تەنها هەڵەیەکی ئاسایی یان تاوانێك لەڕێگەی بێ فکریەوە نەبوو بەڵکی تاوانێکی قەستی بوو لە دژی کردگار. بە پێناسەیەکی تر ئادەم و حەوا ویستیان ببنە خودا...

چۆن ویستیان ببنە خودا؟

---

[24] ﴿پەیدابوون1/1تا31﴾ و ﴿پەیدابوون2/1تا25﴾ و ﴿پەیدابوون3/1تا24﴾

واتە شەیتان پێی وتن بێخەمبن لە بەری ئەو دارە بخۆن و نامرن، بەڵکو خواوەند دەزانێ کە ئەو ڕۆژەی ئێوە لە بەری ئەم درەختە دەخۆن چاوتان دەکرێتەوە و وەکو ئەوتان لێ دێت و چاکە و خراپە دەزانن.

ئادەم و حەوا نەیان ویست گوێدێری ئیرادەی خواوەند بن، بەڵکو دەیان ویست حەز و خواستەکانی خۆیان ئەنجام بدەن.

ئەنجام چی بوو؟

خواوەند بەتووندی لەسەر ئەم ڕەفتارەیان سەرزەنشتی کردن و لە باخی عەدەن وەدەری نان و خستنیە جیهانێکی ترەوە، جیهانێك کە پڕ دەرد و عەزاب و ناڕەحەتی و گرفتاری بوو.

خراپترین بابەت ئەوە بوو کە ئادەم و حەوا ئەو هەڤگری و نزیکیەیان لەگەڵ خالقدا لە دەستدا، لە ئەنجامدا حاڵوباریان تەواو گۆڕا و هیچیان وەك جاران نەمایەوە، لە پێشتردا پاکدامەن بوون چوون پەڕەی گوڵ بەڵام دوای ئەنجامدانی یەکەمین تاوان، بەو شێوەیە نەمان و پیس بوون، پێش ئەوەی کە سەرپێچی خواوەند بکەن گەورە و بەشکۆ و توانا بوون، ئەوەی خواوەند بۆیانی قەرار دەدا بەکەماڵی مەیل جێبەجێیان دەکرد، بەڵام دوای خواردنی بەری درەختی (زانینی چاکە و خراوە) بابە ئادەم و دایە حەوا گوێیان لە دەنگی خواوەندیش دەبوو دەترسان، لەگەڵ ئەوەی دەیان زانی ئەم دەنگە دەنگی خودایە بەڵام لێی نزیك نەدەکەوتنەوە و بە پێچەوانەی ئەوەی کە پێشتر گوێ لەمشت بوون و ڕاهاتبوون لەسەر گوێڕایەڵی کردنی ویستی کردگار، لە دوای خواردنی بەری ئەو درەختە و سەرپێچی کردنی خواوەند، لە ترساندا خۆیان دەشاردەوە.

ئارام–ئارام و بەشێنەی وایان لێهات کە هەرچیەك باش بوو ڕقیان لێهەڵگرت و هەرچیەکیش کە خراپئامێز بوو پەیوەستی دەبوون، ئەم هەڵکفانە لە دژی فەرمانی خودا لە کتێبی پیرۆزدا بە(گوناهی گەورە) یاخود (گوناهی یەکەم) ناودەبرێت و ئاکامی ئەم گوناهەش مەرگە.

ئەم شرۆڤەیە لەسەر (یەکەمین گوناه)ـی مرۆڤ، بۆ ئێمە زۆر جێگای بایەخە، بەهۆی ئەم ڕاڤەیەوە دەتوانین بەحاڵ و گوزەرانی مرۆڤی ئیسەکانێ پەی ببەین. مرۆڤی جیهانی ئێمە وەکو سەرەتای ئادەم و حەوا پاکدامەن و پیرۆز نین. بۆ دەرککردنی ئەم قسەیەش پێویست ناکات لە کەسانی تر بنۆڕین، تەنها ئەوەندە بەسە کە لە دڵەوە لە ناواخن و ویستی خۆمان ورد ببینەوە...ئایا زۆربەی ئەوشتانەی کە سوور دەزانین نادروستە، ئەنجامی نادەین؟!

سور دەزانین کە درۆکردن کارێکی ڕاست نییە، بەڵام زۆرکات درۆ دەکەین بێ ئەوەی سڵ بکەینەوە، درۆ دەکەین لەگەڵ خۆمان، لەگەڵ چواردەورمان، تەنانەت لەگەڵ گیانلەبەران و بوونەوەرانی تریش، خاس دەزانین کە خۆشەویستی لە ڕق باشتر و لەبانترە، بەڵام سەیرکە هەنووکە چەندە لە کەسانێك بەڕقین، بۆچی ئەم کارانە دەکەین؟ ژبەرکو لە دایك و باوکی سەرەتایمان واتە ئادەم و حەوا ئەم سەرپێچی و تاوانانەمان بەمەردەڵا بۆماوەتەوە، هەروەك ئەوان مەیلمان نییە ویست و فەرمانەکانی خودا کە لەسەرمانە بە جوانی ئەنجام بدەین.

**کاتێك کە منداڵێك دێتە دونیاوە، ڕواڵەتەن پاك و بێ گوناھە، بەڵام ھەر زوو بەدکاری لـە ئەودا دەر دەکەوێت ھەروەکو داودی پەیامھێن فەرمووی:**

**"من ھەر لـە بنچینەوە تاوانبارم"[25]**

**ھەمووان ناچارین دان بەوەدا بنێین کە بوونی مرۆڤ ھەر لـە ئەزەلـەوە بەتاوانەوەیە، دەبێ بەو میھر و ھەلـپێدانە دووبارەیەی خودا بە ئێمە دڵخۆشبین، وە بە فەرمایشتی خواوەند قایل بین کە دەفەرموێت:**

**"دڵ لـەھەموو شتێك فریودەرترە و زۆر نەخۆشە، کێیە ئەو دەناسێت"[26]**

**ھەر لـەبەر ئەمە بوو کە عیسای مەسیح فەرمووی:**

**"ئەو شتەی کە لـە مرۆڤ دێتە دەرەوە، ئەوەیە کەمرۆڤ گڵاو دەکات، چونکە لـە ناوەوە و دڵـی مرۆڤەوە، بیری خراپە دێتە دەرەوە"[27]**

**خودا، دڵـی ھەموو جۆرە مرۆڤێك بەباشی دەناسێت و فەرمویەتی :**

**"کەس بێ تاوان نییە، تەنانەت یەك کەسیش، کەس نییە تێبگات، کەس نییە بەدوای خودا بگەڕێت، ھەموو ڕوویان وەرگێڕا و تێکڕا بێ سوود بوون، (کەس نییە چاکە بکات تەنانەت یەك کەسیش نییە)[28]، (قوڕگیان گۆڕێکی کراوەیە، بەزمانیان فێڵبازی دەکەن)[29]، (ژەھری تیرە مار لـەژێر لـێویانە)[30]، (دەمیان پڕە لـە نەفرەت و تاڵاو)[31]، (پێیان خێرایە بۆ خوێنڕشتن، وێرانی و دەردەسەری لـەسەر ڕێگایانە، ڕێگای ئاشتی بێ نازانن)[32]، (ترسی خودایان لـەبەرچاو نییە)"[33][34]**

**بەڵام تەنھا یەك کەسایەتی بەدەرکراوە، کە لـە مرۆڤ گەورەتر و باڵاترە و من دواتر دەربارەی ئەو کەسایەتیە**

---

[25](ئەی خودایە، بەگوێرەی خۆشەویستییە نەگۆڕەکەت لەگەڵم میھرەبان بە، بەگوێرەی زۆری بەزەیی خۆت یاخیبوونم بسڕەوە، بەتەواوی لە تاوانەکانم بمشۆرەوە و لە گوناھەکانم پاکم بکەرەوە، چونکە من یاخی بوونم ئەزانم، ھەمیشە گوناھەکانم لە بەردەممە، لە دژی تۆ، تەنھا تۆ، گوناھم کرد، لە بەرچاوی تۆ خراپەم کرد، تاکو لە بڕیارەکانت ڕاست بیت، دادپەروەربیت لە حوکمەکانت، ئەوەتا من بەزگماکی گوناھکارم، گوناھبارم لەو کاتەوە کەدایکم سکی بەمن پڕبووە) ﴿زەبووری**51**/**1**تا**6**﴾

[26](دڵ لە ھەموو شتێك فریودەرترە و دەرمانی نییە، کێ دەیناسێت؟ ...منم یەزدان دڵ دەپشکنم، دەرون تاقی دەکەمەوە، بۆئەوەی ھەریەکە بەگوێرەی ڕەفتارەکەی پێی بدەم، و پێی ببەخشم، بەگوێرەی شایستەی کردارەکانی) ﴿یەرمیا**17**/**9**تا**11**﴾

[27](ئەوەی لە دەرەوەی مرۆڤ دێتە ناویەوە ناتوانێت گڵاوی بکات، چونکە ناچێتە دڵیەوە، بەڵکو دێتە ناو سکیەوە و ئەوکات لە لەشی دێتە دەرەوە، بەڵام ئەوەی لە مرۆڤەوە دەردەچێ، ئەوەیە مرۆڤ گڵاو دەکات، چونکە لەناوەوە و دڵی مرۆڤەوە بیری خراپ دێتە دەرەوە، وەك: بەرەڵایی، دزی، کوشتن، داوێن پیسی، چاوچنۆکی، خراپەکاری، ھەڵخەڵەتاندن، بەدڕەوشتی، چاو پیسی، کفر، لوتبەری و گێلی، ئەم شتانە ھەموو لە ناوەوەی مرۆڤ ھەڵدەقوڵێت و مرۆڤ گڵاو دەکات)

﴿مەرقۆس**7**/**18**تا**24**﴾

[28]﴿زەبوورەکان**14**/**1**تا**3**﴾ و ﴿زەبوورەکان**53**/**1**تا**3**﴾

[29]﴿زەبوورەکان**5**/**9**﴾

[30]﴿زەبوورەکان**140**/**3**﴾

[31]﴿زەبوورەکان**10**/**7**﴾

[32]﴿ئیشایا**59**/**7**و**8**﴾

[33]﴿زەبوورەکان**36**/**1**﴾

[34]﴿ڕۆما**3**/**10**تا**19**﴾

ڕوونکردنەوەی زیاتر دەدەم. حاڵەت و وەزعی مرۆڤ زۆر مایەیی ئەسەفە! چوون لە ئەنجامی نافەرمانی، پەیوەندی ڕاستەوخۆی خۆی بەخوداوە بڕیوە بەچەشنی مەڕێکی ونبووە کە لە بیابانێکی لمی وشکی بێ سەوزای و ئاودا، بەشێنەی لە مەرگ نزیك دەبێتەوە هەروەك وتراوە لە کتێبی پیرۆز:

"هەموو وەك مەڕومالاّت بلاّوەمانکردووە، هەریەك ملی ڕێی خۆمان گرتووە[35] چوون ئیتر ڕۆڵەی ڕۆحانی خواوەند نییە و بۆتە دوژمنی خوداوەندد و دیلی شەیتان[36] و ئیتر ناتوانێت لە ڕێگا پیرۆزەکانی خواوەند هەنگاو هەڵهێنێت و لە گوناهدا مردووە[37]

هەربەوشێوەی کە خودا بەئادەمی فەرموبوو ئەنجامی گوناهـ مەرگە_مەرگێکی جەستەیی و ڕۆحی_.

---

[35] ﴿ئیشایا 6/53﴾

[36] ﴿ڕۆما 15تا18﴾

[37] ﴿ئەفسۆس 1/2﴾

(بەشی سـێیەم)

# گوناهـ چییە؟

**هاوڕێی هێژام**

**ئێستا هەوڵدەدەم زیاتر ڕوونی کەمەوە کە گوناه چییە.**

**گوناه لای ئێمەی مەسیحی تەنها ئەنجامدا کاری خراپی وەکو دزی، داوێنپیسی، بەدمەستی و کوژتن نییە، بەڵکی گوناهی گەورە، یان بەشێوەیەکی تر بڵێم گوناهی بنچینەی لای ئێمە جویێ بوون و دورکەوتنەوەیە لـە خودا، ئەم گوناهەش سەرەکیترین هۆکارە بۆ ئەنجامدانی گشت گوناهێکی تر.**

**گوناهـ تەنها بەواتای ئەنجامدانی بەدکرداری و بەدمامەڵەیی ئێمە نایەت دەرهەق بە پێشهات و مرۆڤەکانی چواردەورمان، بەڵکی تەنانەت حەسوودی، ڕق، نەفرەت و فکرگەلی شەهوەتپەرستانە بەگوناهـ دێتە هەژمار، عیسای مەسیح فەرمووی دوو دانە لـە گەورەترین فەرمایشتە بنەڕەتییەکانی خودا ئەوەیە کە:**

**"خودات خۆش گەرەك بێت لـەناخی دڵەوە، وە ئەوەی لێتەوە نزیکە وەك خۆت خۆشت بوێ، ئیتر هیچ ڕاسپاردەیەك مەزنتر نییە لـەم دوو ڕاسپاردەیە.."[38]**

**بەم گوێرەیە ئەم دوو فەرمایشتە سەرەکیترین و بنچینەیترین فەرمایشتی خواوەندە بۆ ئێمە، لـەبەر ڕۆشنای ئەمەشدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە درێخیکردن و کەمتەرخەمی کردنی ئێمە لـە خۆشەویستی نیشاندان بەرامبەر بەخودا هەروەها بەرامبەر بەکەسانی تر بەگەورەترین تاوان دێتە هەژمار.**

**ئایا هەنوکە ئێمە دەتوانین کەسێك بدۆزینەوە ئەم دوو فەرمایشتە بنچینەیەی خودای لـە خۆیدا بەشێوەیەکی ڕاست و تەواو جێبەجێ کردبێت؟ بێ شك نەخێر! تەواوی مرۆڤ ئەم فەرمایشتە گەورانەی خودایان شکاندووە و پشتگوێ خستووە، جگە لـە عیسای مەسیح کە بە تەواوی بێگوناهـبوو. ئەو ژیانێکی بێ کەمایەسی ژیا و زینگانیەکی نەبڕاوەی بە بەش بوو، ئەم ژیانە بێ کەمایەسی و نەبڕاوەیەش هەمان ئەو ژیانەیە کە خودا دەیەوێت بەبەشی ئێمەش ببێت، هەروەك لـەسەر زاری عیسای مەسیحەوە لـە پەرتوکی پیرۆزیشدا لـەوبارەوە نوسراوە کە:**

**" ڕاست و تەواو بن، هەروەك چۆن باوکی ئاسمانیتان ڕاست و تەواوە.."[39]**

---

[38]﴿مەرقۆس 29/12تا34﴾

[39]﴿مەتا 48/5﴾

لێرەدا پرسیارێك دێتەپێش ئەویش ئەوەیە : ئێمەی تێوەگلاو لە جۆرەها شێوەی جیاواز لە تاوان، کە دڵ و دەرونمان پڕ لە نەفرەت و ڕقە چۆن دەتوانین بەو شێوەیە بین کە خواوەند فەرمانی پێکردووین؟ چۆن دەتوانین بەو شێوەیە خاس و بێ گوناه بین؟

سەیرکە هاوڕێکەم... کەسێك کە شێرپەنجەی توش بوویێت و بەدەست ئەو نەخۆشییەوە بناڵێنێت، هیچ پێویستی بەوە نییە خولی بۆ بکەیتەوە و پێی بڵێیت ئەمە شێوازی کارکردنی شێرپەنحەیە و شێرپەنجە واخراوە، وا ترسناکە و ئەمە یاساکانی کارکردنی ئەو نەخۆشیەیە، بەڵکی پێویستی بەدکتۆرێکی زرنگ و لێزان هەیە لەبواری نەخۆشی شێرپەنجەدا کە خاسەوەی بکات و ڕزگاری بکات. بە هەمان وێنە کەسێك کە گرفتاری نەخۆشی گوناهە، پێویستی بەوە نییە شەرحی قورسی بنەماکانی شەریعەتی بۆبکەیت و دنیایە کاری لێ نەهی کەیت، سەری بەشێوەیەك لێ بشێوێنیت کە هیچ شتێکی بۆ بەراورد نەکرێت، بەڵکو تەنها پێویستی بەوەیە پزیشکێکی ڕۆحانی و تێگەشتوو لەگەڵی خەریك بێت، بە شێنەیی تا سەرلەنوێ ئەو کەسە دروست بکاتەوە و لە هزر و دڵ و دەرونی ئیرادەیەکی نوێ بسازێنێت، هێزێکی پێ ببەخشێت بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو شتانەی خواوەند لێی دەخوازێت ئەنجامی بدات.

زۆرینە پێویستیان بەوەیە کەسێك هەبێت، بەتوانابێت و ئەوان لە گوناه ڕزگاربکات و بیانکاتە ڕۆڵەی خواوەند.

لە دواتردا ڕوونی دەکەمەوە کە خواوەند لە سایەی ڕەحمەتی بێ پایانی خۆی چۆن ڕزگاریکارێکی بۆ جیهان بەرهەم کردووە.

(بەشی چوارەم)

# ئایا مەسیحییەکان باوەڕیان بە پەیامهێنەران و فریشتەکان هەیە؟

**هاوڕێی هێژام**

**ئێستا بەرسڤی پرسیارێکی تر دەدەمەوە لـە بارەی بیروباوەڕی مەسیحیەکان سەبارەت پەیامهێنەران و فریشتەکان.**

**مەسیحییەکان بڕوایان وایە کە خودا بۆیە پەیامهێنەرانی ناردووە، تا لـە ڕێگەی ئەوانەوە پەیامی خۆی بگەیەنێتە خەڵکی.**

**لـە سەردەمی ناردنی پەیامهێنەراندا زۆربەی خەڵکی_بە هۆی تاوانبارییانەوە_، یان نەیانگەرەك بوو دەنگی خواوەند بژنەون، یان بەهۆی کەڕبوونی گوێی_ڕوحیان_ توانایی بیستنیان نەمابوو، ئەمما ژن و پیاوانێك هەبوون کە تۆبەیان کرد و بەر لێخۆشبوونی خودا کەوتن. خودا قسەی لـەگەڵیاندا کرد و ئەوانی ڕاسپارد پەیامەکەی وی بە دیترانیش بگەیەنن. لـەم سۆنگەیەوە ئەوان بوونە پەیامهێنەرانی خودا ژبۆ خەڵکی.**

**خەوەرداری ئێمە لـە مژادی پەیامهێنەران ڕاستەوخۆ لـە کتێبی پیرۆزەوە سەرچاوە دەگرێت، کە لـە خۆگری شرۆڤەی ژیان و قسەیەل و نوسراوی هەندێك لـە پەیامهێنەرانە بۆ هێنانی پەیام لـەلایەن خواوەندەوە کە بۆ مرۆڤەکان هەڵبژێری کراون.**

**هێندێ لـەو پەیامهێنەرانەی لـە کتێبی پیرۆزدا ناویان هاتووە بریتین لـە :**

**-ئیبراهیم**[40]

**-موسا**[41]

**-هارونی برای موسا**[42]

**-مریەمی خوشکی موسا**[43]

**-ناپـان**[44]

---

[40] **Abraham** سەرەتا ناوی ئەبراهام بوو، واتە: باوکی پایەبەرز، بەڵام پاش ئەوەی خودا بەڵێنی پێدا نەوەی زۆر بکات، پێی فەرموو ناوی خۆت بکە ئیبراهیم، واتە باوکی کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر. لەئینجیلدا بەباوکی بڕواداران ناوی براوە، لەکوردەواریش بەحەزرەتی ئیبراهیم.

[41] **Moses** یەکێکە لەپەیامهێنەرانی خودا، لەفاقۆس لەپارێزگای شەرقیەی میسر کەناو دەبرا بەجاسان لەردەمی فیرعەونەکاندا لەدایك بووە و ژیاوە، واتای ناوی مووسا بە (لەئاو دەرهێنراو) دێت، لەتەمەنی 120ساڵیدا کۆچی دوای کردووە.

[42] **Aaron (Brother of Moses)** هارون کاهین بووە و برای موسا بووە، یارمەتی دەری موسابوو لەگەیاندنی وشەی خودا بەگەلی ئیسرائیل، هارون بەپەرجووی گۆچانەکەی بەناوبانگە، کەبووە مارێکی گەورە و مارەکانی تری هەڵلوشی.

[43] **Miriam(Sister of Moses)** بە کەلوسوم یش ناو دەبرێت، خوشکی موسا و هارون بوو

[44] **Nathan** (لەبارەی ئەم پیامهێنەرەوە لە پەیمانی کۆندا — یەکەم ساموئێل لەزۆر بەشیدا باسی کراوە، بۆنموونە : یەکەم ساموئێل1/14تا14)

-ساموێل[45]

-داود[46]

-ئیلیاس[47]

-ئەلیەسع[48]

-ئەشعییا[49]

-یەرمیا[50]

-یونس[51]

-یوئێل[52]

-دانیال[53]و یەحیایی تەعمیددەر [54]، یەحیای تەعمیددەریش کۆتا پەیامهێنەری پێش هاتنی یێشوع(عیسا)ی مەسیح بوو.

ئیبراهیم بە دۆستی خواوەند و باوکی باوەڕداران ناوی دەرکردووە، لەلایەن خواوەندەوە هەڵبژێری کرا تا باوکی زۆرێك لە قیلەکان بێت. لە تەمەنێکی زورهانیدا کوڕێکی بەئەو و (سارە)[55]بەخشی بەناوی (ئیساك/ئیسحاق).

ئیبراهمی دۆستی خودا بۆ گوێڕایەڵیکردن لە دەستوری خودا ئامادەبوو ڕۆڵەکەی خۆی(واتە ئیسحاق) بکاتە قوربانی، بەڵام خودا فەرمانی دا دەست لە قوربانی کردنی ئیسحاق هەڵگرێت و سابرێنێکی بەرهەڤکرد تا لە جێگای ئیسحاق بکرێتە قوربانی، هەروەك لە کتێبی پیرۆزدا لەم بارەوە نوسراوە کە:

"خودا ئیبراهیمی تاقیکردەوە. پێی فەرموو : ئیبراهیم!

---

**Samuel**[45] یان ئاشمۆئێل، ناوەکەی بەواتای گویَ لیَ ڕاگیراو لەلایەن خودا دێت، یەکێکە لەپەیامهێنەرەکان بڕوانە: (یەکەم ساموێل/پەیمانی کۆن)

**David**[46] داودی زەبوورنوس، دووەم پادشا ئیسرائیل بوو، لەساڵی 1010پێش زاین، هاتە سەرتەختی پاشایەتی. بەمەزنترین پاشای ئیسرائیل دادەنرێت.

**Elijah**[47] لە کلتوری کوردی بە (خدری زیندە)ناسراوە، لە سەدەی نۆیەمی پێش زاین ژیاوە، یەکێکە لە پەیامهێنەرە ناودارەکانی خودا لە پەیمانی کۆن، چەندین پەرجوو و کاری گەورەی کردووە، ئەلیاس بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان و نەمردووە، هەتا ئێستاش بەزیندوێتی ماوەتەوە.

**Elisha**[48] یەکێکە لە پەیامهێنەرانی خودا لە ئاینە ئیبراهیمییەکان.

**Isaiah**[49] یەکێکە لە پەیامهێنەرە ناودارەکانی خودا لە پەیمانی کۆن، لە سەدەی هەشتەمی پێش زاین لە شاری قودس(ئۆرشەلیم) ژیاوە، لە کتێبی پیرۆزدا نوسراوێکی گەورەی هەیە بەناوی خۆی، وە سەدان ساڵ پێش هاتنی عیسای مەسیح پێشبینی هاتنی ئەوی کردبوو.

**Jeremiah**[50] لە سەدەی حەوتەمی پێش زاین ژیاوە، خزمەتەکەی لە626پێش زاین، تاکەوتنی ئۆرشەلیم 587ی پێش زاین بوو، یەکێکە لە پەیامهێنەرەکانی خودا لە پەیمانی کۆن.

**Jonah**[51] لە زمانی عیبری پێی دەوترێت یۆناه واتە کۆتر، لە نزیکەی سەدەی هەشتەمی بەر لە زاین، لە ئیسرائیل لە دایك بووە، بەو چیرۆکە بەناوبانگە کە لەنێو زگی ماسیەکی گەورەدا ماوەتەوە کاتێك سەرپێی فەرمانی خودای کردووە.

**Joel**[52] یەکێکە لە پەیامهێنەرانی خودا، بڕوانە (پەیمانی کۆن/یوئێل1و2)

**Daniel**[53] یەکێکە لە پەیامهێنەرانی گەلی ئیسرائیل لە سەدەی حەوتەمی پێش زاین دا.

**John the Baptist**[54] یەکێکە لە پەیامهێنەرە بێ کتێبەکان، وە کاری لەئاو هەڵکێشانی خەڵك بووە بەمەبەستی تۆبە و پاك بووەنەوە, دوای ئەم عیسای مەسیح دێت.

[55]هاوسەری ئیبراهیم بوو.

**ئەویش گوتی: ئەوەتام.**

**ئینجا خودا فەرمووی: کوڕەکەت، تاقانەکەت ئەوەی کە خۆشت دەوێت، ئیسحاق دەڵێم، ببە و بڕۆ بۆخاکی مۆریا. لەوێ بیکە بە قوربانی سوتاندن، لەسەر یەکێك لە کێوەکان کەخۆم پێت دەڵێم، بۆ بەیانی ئیبراهیم زوو لەخەو هەستا و گوێدرێژەکەی کورتان کرد، لەگەڵ خۆیدا دوان لە خزمەتکارەکانی و ئیسحاقی کوڕی برد، داریشی بڕی بۆ قوربانی سوتاندن، ئینجا هەستا و بەرەو ئەوشوێنە چوو کە خودا پێی فەرموو بوو، لە ڕۆژی سێهەم ئیبراهیم چاوی هەڵبڕی، لە دوورەوە شوێنەکەی بەدیکرد، ئیتر ئیبراهیم بەدوو خزمەتکارەکەی گووت: ئێوە لێرە لەگەڵ گوێدرێژەکە دانیشن، من و ئیسحاق هەتا ئەو جێگایە دەچین و کڕنۆش دەبەین و دوای دەگەڕێینەوە لاتان، ئیبراهیم داری قوربانی سوتاندنەکەی هەڵگرت و خستییە بان کۆڵی ئیسحاقی کوڕی، خۆشی ئاگر و چەقۆکەی هەڵگرت و هەردووکیان پێکەوە ڕۆشتن.**

**ئیسحاق بە ئیبراهیمی گوت: باوکە!**

**ئەویش وەڵامی دایەوە: ها کوڕم؟**

**ئیسحاق گوتی: ئەوەتا ئاگرەکە و داری سوتاندنەکە، ئەی کوا بەرخەکە کە بۆ قوربانیەکەیە؟**

**ئیبراهیم وەڵامی دایەوە: خودا بۆخۆی بەرخێك بۆ قوربانی سوتاندنەکە تەییار دەکات کوڕم..ئیتر هەردووکیان پێکەوە ڕۆشتن.**

**کاتێك گەشتنە ئەوشوێنەی خودا پێی فەرموو بوو، ئیبراهیم قوربانگایەکی دروست کرد و دارەکانی لەسەر ڕێك خست، ئیسحاقی کوڕی بەستەوە و خستییە سەر قوربانگاکە لەسەر دارەکان، ئیتر ئیبراهیم دەستی درێژکرد و چەقۆکەی هەڵگرت، هەتا کوڕەکەی خۆی سەربڕێت، بەڵام فریشتەی یەزدان لە ئاسمانەوە بانگی کرد و گوتی: ئیبراهیم! ئیبراهیم!**

**ئیبراهیمیش وەڵامی دایەوە: ئەوەتام.**

**فریشتەکە پێی گوت: دەست بۆ کوڕەکە مەبە و هیچی لێ مەکە، ئێستا زانیم تۆ لەخودا دەترسیت، چونکە لە پێناو خوا دەستت بەکوڕە تاقانەکەتەوە نەگرت، ئیبراهیم چاوی هەڵبڕی و بینی وابەرانێك لە دوایەوە لەناو دەوەنێکدا بەهەردوو قۆچی گیربووە، ئیبراهیم چوو بەرانەکەی گرت و سەری خست، وەك قوربانی سوتاندن لەجێی ئیسحاقی کوڕی. ئیتر ئیبراهیم ئەو شوێنەی ناو نا، یەزدان دابینی دەکات..."[56]**

**دمایی خواوەند گفتی دا بەئیبراهیم کە لەڕێی نەوەی ئیسحاقەوە خێروبەرەکەت و فەڕ، بەسەر جیهاندا دەڕێژێت و ڕزگاریکارێك دەهێنێتە بوون، ئەم وادەی خواوەندیش لە عیسای مەسیحدا گەشت بەئەنجام و هاتەدی.[57]**

---

[56]﴿پەیدابوون**21/1**تا**15**﴾

[57](دوای ئەوەی ئیبراهیم، ئیسحاقی سەرنەبڕی بەفەرمانی خودا و لەژێر تاقیکردنەوەکەدا دەرچوو، فریشتەی یەزدان جارێکی دیکە لە ئاسمانەوە ئیبراهیمی بانگ کرد و گوتی: یەزدان دەفەرموویێت سوێند بێت بەخۆم، لەبەر ئەوەی تۆ ئەمەت کرد و دەستت بەکوڕە تاقانەکەتەوە نەگرت، بێگومان بەرەکەتدارت دەکەم و نەوەکەت وەك

**دوای عیسای مەسیح پەیامهێنەرانی(یان روسولانـ)ـی تری وەك (پەترۆس و پۆڵۆس) دەرکەوتن کە کەلامی خواوەندیان بە خەڵکی دەگەیاند و خەڵکیان فێر دەکرد بە عیسای مەسیح باوەڕبهێنن. ئێمە باوەڕدارین کە ئەوان پەیامهێنەر و پەیامگەیەنەری خواوەندن لەو ڕووەوە کە لە لای ئێمە هەر کەسەك پەیامی ڕاستەقینەی خواوەند بەخەڵکی بگەیەنێت لامان ئاساییە بە پەیامبەر، پەیامهێنەر یان بە پێغەمبەر ناوی ببەین.**

**دەڵێن بیروباوەڕی مەسیحییەکان دەربارەی پەیامهێنەران لە هەندێ لایەنەوە تۆفیری فرەیە لە بیروباوەڕی هەڵگرانی ئاینەکانی تر..لێرەدا حەز دەکەم بەچەند حەقیقەتێکی گرنگ ئاماژەبکەم:**

**1– ژمارەیەك لە پەیامهێنەران زانیاری لەبارەیانەوە زۆر کەمە یان هەر نییە و ئێمەش شتێکی وەها لە بارەیانەوە نازانین.**

**2–هەموو پەیامهێنەران تا ئەو شوێنەی کە دەزانین لە بنەچەی ئیبراهیمی دۆستی خودا و ئیسحاقی ڕۆڵەیەتی.**

**3– پەیامهێنەران لە لایەن خوداوە لە ماوەیەکی دوو هەزار ساڵیدا نێردراون و ڕاسپێردراون.**

**4– پەیامهێنەران بەگشتی بۆ گەلی ئیسرائیل نێردراون. ئەو گەلەی خودا هەڵیبژاردن گەلی دانەبڕێری خۆی بن و بەهۆی ئەوانەوە حەقیقەتەکانی خۆی بەهەموو خەڵکی جیهان نیشانبدات.**

**5–پەیامهێنەران بێ‌گوناح نەبوون" بەڵکو خەڵکانێك بوون کە گوناهانی ئەوان بەخشرابوو.**

**6–پەیامهێنەران لە نێو چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگا هەریەکە و بەجۆرێك بەپێی کۆمەڵگاکەیان دەرکەوتوون، هەندێکیان زەنگین و هەندێکیشیان هەژاربوون، هەندێك خوێنەوار، هەندێکیش نەخوێنەوار و زانیاری کەم بوون، هەندێکیان بەتەمەن، هەندێکیش گەنج بوون.**

**7–هەندەك لە پەیامهێنەرانی وەك ئیلیا و یەحیای تەعمیددەر، کتێبیان نەنوسیوە، بەڵام هەندێك کتێبیان هەبووە وەك موسا، داود، ئەشعییا، یوحەنا و پۆڵس و پەیامی خواوەندیان نوسیوەتەوە تا نەوەکانی دواتر کە دێن، بتوانن بیخوێننەوە و لە فەرمایشتی خودا تێبگەن.**

**8–پەیامی خوداوەندی بەشێوەی جیاواز دادەبەزییە سەر پەیامهێنەران، هەندێکیان سەدای خودایان گوێ لێ دەبوو، هەندێکی تریان پەیامی ئەویان لە ڕێگای فریشتەکانەوە پێ دەگەشت، هەندێکیشیان خەویان دەبینی، بەبێ دڕدۆنگی هەندێکی تر لە پەیامهێنەران پەیامی خواوەندیان بەفکر و دڵیان دەرك دەکرد، دڵنیابوون کە خودا لەگەڵیان قسەی کردووە و دەیانتوانی بە باوەڕبەخۆبونێکی تەواوەوە بە خەڵکی بڵێن " خواوەند بەم شێوەیە دەفەرموێت..".**

**9–بە بڕێ لە پەیامهێنەران هێزی ئەنجامدانی پەرجوو بەخشرابوو، تا حەقیقەت پەیامەکەیان باشتر بسەلمێنن، بەڵام هەندێك پەیامهێنەریش هەبوون، هیچ پەرجوویەکیان ئەنجام نەدا و ئەو هێزەیان لەلایەن کردگارەوە پێ نەبەخشرابوو.**

---

ژمارەیی ئەستێرەکانی ئاسمان و لمی سەر کەناری دەریا زۆر دەکەم، نەوەت دەبێتە میراتگری دەرگای دوژمنەکانی، لە ڕێگای ئەم نەوەیەی تۆشەوە هەموو نەتەوەکانی سەرزەوی بەرەکەتدار دەبن، چونکە تۆ گوێرایەڵی فەرمایشتی خودا بوویت) ﴿پەیدابوون**21/15**تا**19**﴾

پەیامهێنەران کە پێش عیسای مەسیح دەرکەوتن، بۆ خەڵکییان ڕووندەکردەوە کە خودا کێیە و لەوان چی دەخوازێت، وە ئاگاداریان دەکردنەوە بەوەی خودا ئەوکەسانەی سەرپێچی لە فەرمایشتەکانی دەکەن تەمێ دەکات. لە هەمانکاتیشدا ئەگەر دەست لە تاوانکاری هەڵبگرن بۆلای کردگاری خۆیان بگەڕێنەوە ئەوا لێیان خۆش دەبێت و بەرەکەتیان بەسەردا دەڕژێنێت.

بەهۆی موساوە کە تەنها پەیامهێنەری شەریعەت و یاساکان بوو بۆ ئیسرائیل، خواوەند یاسایەلی زۆری بە گەلی ئیسرائیل بەخشی، ئەو پەیامهێنەرانەشی دوای موسا هاتن خەڵکیان هاندەدا یاساکانی خودا گوێڕایەڵی لێ بکەن. بەڵام چونکی مرۆڤانی گوناهکاربوون ڕێی تێنەدەچوو بتوانن یاسای پیرۆزی خواوەندیی بە شێوەیەکی دروست و تەواو ئەنجام بدەن و لەم ڕووەشەوە یاسایەکی بەهێز نەبوو کە بتوانێت بۆ ئەوان ڕزگاری فەراهەم بکات، بەڵام پەیامهێنەران ئەوەیان پێ دەوتن و خەڵکیان لەوە حاڵی دەکرد کە چەندە پێویستیان بە ڕزگاری کارێکی ڕاستەقینە هەیە.

یەکێ لە بەرجەستەترین کارەکانی پەیامهێنەران ئەوەبوو بەخەڵکیان دەوت خواوەند ڕزگاریکارێك دەنێرێت کە تەواوی مرۆڤیەلی جیهان نیازمەندن پێی.

گاڤا بەمەوێت بۆ ئێوە سەبارەت بەعیسای مەسیح بنوسم، هەندێ لە گفتە بالاَکان، کە لەنێو کتێبی پەیامهێنەرانی دێریندا هاتووە وەبیردێنمەوە. لە کتێبی پیرۆزدا ئاماژەیی زۆر بە ئافرێنراوی_جگە لە مرۆڤ_ بوونی هەیە کە بەهۆی خوداوە ئافرێنراون، ئەم ئافرێنراوانە، فرەتر بە(فریشتەکان)ناودەبرێن و پەیامگەیەنەرانی خودان، زۆربەیان ڕاسپێردراون تا ئیرادەی ئیلاهی بۆ پەیامهێنەران و ئیمانداران ئاشکرابکەن. بەنمونە: فریشتەکان لەسەر شێوەی مرۆڤ خۆیان بە ئیبراهیم و موسا و هەندێکی تر نیشاندا سەبارەت بەناویش، تەنها ناوی دوو فریشتە واتە (میکایل)[58] و (جوبرایل)[59] لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە.

بەپێی ئەو زانیاریانەی لە کتێبی پیرۆزەوە دەستمان دەکەوێت، ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە، جگە لە فریشتە گوێڕایەڵ و پیرۆزەکان، ڕۆحگەلی تر بوونیان هەیە کە سەرپێچیکار و دوژمنی خواوەندن و سەرکردەی ئەو ڕۆحانەش (ئەهریمەن[60]/شەیتان[61])ە. مەسیحییەکان بەگشتی وابیردەکەنەوە کە شەیتان لە لایەن خواوەندەوە بەپاکی ئافرێنراوە بەڵام بەهۆی لەخۆبایبوون و لەخۆ گۆڕانیەوە لە بەرامبەر خواوەند نافەرمانی کرد و لە ئەنجامدا پلەی باڵاو پیرۆزی ئاسمانی لێ سەندرایەوە، ئەوەشی کە ئەرواحی ئەو پەیڕەوی دەکات، بەهەمان دەرد دەچێت و هیچ پلەیەکی نابێت لەلای خواوەند.

---

[58] Michael
[59] Gabriel
[60] Devil
[61] Satan

**ئێستا ئەهریمەن و ئەهریمەنزادەکان بە هەموو توانای خۆیانەوە هەوڵدەدەن ویستی خواوەند لەسەر ڕووی زەوی بەئەنجام نەگات، وەك پێشتر باسمان لێوەکرد ئەوە ئەهریمەن بوو (حەوا)ی لە باخی عەدەن فریودا، دەی هەر لەو زەمانەوە تا ئێستا کۆشش دەکات خەڵکی لە خودا دووربخاتەوە. ئەهریمەن و ئەهریمەن پەیڕەوەکان، هەر خەریکی کارکردن نین لەگەڵ مرۆڤی ئاسایدا بەڵکی تەنانەت دەیانەوێت پیاوچاکان و ئیماندارانی ڕاستەقینە و تەنانەت پەیامهێنەرانیش لەڕێ لابدەن، بۆنمونە ئەهریمەن: هەوڵی دا عیسای مەسیح ڕازی بکات کە لە ویستی خودا سەرپێچی بکات...بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، هەروەك لە کتێبی پیرۆزدا لەم بارەوە نوسراوە:**

**"عیسا بەهۆی ڕۆحی پیرۆزەوە برایە دەشت و دەر، تاوەکو شەیتان تاقی بکاتەوە. دوای ئەوە چل ڕۆژ و چل شەو بەڕۆژوو بوو، برسیی بوو. شەیتان وەك تاقی کەرەو هاتە پێشی و پێی وت: (ئەگەر تۆ ڕۆڵەی خواوەندیت بەو بەردانە بڵێ ببن بەنان.) عیسا وەڵامی دایەوە و وتی: مرۆڤ تەنها بەنان ناژی، (بەڵکو بەو وشانەش دەژی کەلە دەمی خواوەندەوە دێتەدەر.) ئینجا لەلایەن شەیتانەوە بەرەو شاری پیرۆز برا، عیسای لەقەراغ سەربانی پەرستگا ڕاگرت و پێی ووت: (ئەگەر تۆ ڕۆڵەی خواوەندیت لێرەوە خۆت فڕێدە خوارەوە..چونکی نوسراوە کە: خواوەند لە ڕێی فریشتەکانەوە دەتپارێزێت و لەسەر دەستی وان هەڵتدەگرن نەبادا پێت وەبەردێك بکەوێت.) عیسا بە شەیتانی وت: (نوسراوە کە: خوداوەند خودات تاقی مەکەرەوە.) دیسان لەلایەن شەیتانەوە برایە سەر لوتکەی چیایەکی زۆر بەرز، شەیتان بەجادووی خۆی هەموو مەزنێتی و پادشایەتی جیهانی پیشانی عیسا دا و پێ‌ی وت: ( هەموو ئەم سامان و پادشایەتی و دەسەڵاتە دەکەم بە موڵکی تۆ ئەگەر سەر دانەوێنیت و کڕنۆشم بۆ بەریت). عیسای مەسیحیش پێ‌ی وت: ( ئەی شەیتان لێم دوورکەوە چونکە نوسراوە کە : بۆخواوەند خودات کڕنۆش بەرە و تەنها ئەو بپەرستە.) دوای ئەمە شەیتان نائومێد بوو لە عیسا و وازی لێ هێنا.."[62]**

**شەیتان خاوەنی هێزێکی هێجگار زۆرە، بەڵام هەرگیز ناتوانێت بەرامبەری لەگەڵ خواوەندا بکات و هەر لە ژێر کۆنترۆڵی خودادایە. مەسیحییەکان نابێت لە شەیتان و ڕۆحە پیسەکان ترسێکیان هەبێت، بەو هێزەی کە عیسای مەسیح بە ئێمەی دەبەخشێت، دەبینە خاوەنی بەرگریەکی وەها کە لە بەرامبەر شەیتان و ڕۆحەپیسەکاندا دەتوانین زۆر بەباشی خۆمان ڕابگرین و ئەو لە خۆمان دووربخەینەوە، وەلە کۆتایشدا خواوەندمان، شەیتان و ڕۆحە پیسەکانی ئەم جیهانە دەخاتە نێو ئاگری هەمیشەییەوە، هەروەك لە کتێبی پیرۆزیشدا ئەمەمان بۆ ڕوون کراوەتەوە.[63]**

---

[62]﴿مەتا**1/4**تا**11**﴾

[63](ئەو ئیبلیسەی چەواشەی دەکردن فڕێدرایە دەریاچەی ئاگر و گۆگرد، کە دڕندەکە وپێغەمبەرە درۆزنەکەی لێیە، بۆ هەمیشە لەوێندەر ئازار دەدرێن)
﴿ئاشکراکردن**10/20**تا**11**﴾

(بەشی پێنجەم)

# کتێبی پیرۆزی مەسیحییەکان کامانەن؟

**هاوڕێی هێژام**

**ئێستە وەڵامی پرسیارێکی تر دەدەمەوە کە ئاڕاستەمان زۆر دەکرێت، لەسەر ئەوەی ئایا ئەو کتێبە پیرۆزانە کامانەن کە مەسیحییەکان باوەڕیان پێی هەیە، وەك ڕوونە لاتان، لە زەمانی زوودا مەسیحیەکان و یەهودییەکان بە (ئەهلی کتێب)ناودەبران، وە لە ڕاستیشدا ئەم ناونیشانە زۆر بەجێ و شایستەیە، لەبەر ئەوەی یەهودی و مەسیحییەکان لە ناخی دڵەوە کتێبی پیرۆزی خۆیان پاراستووە و پارێزگاری کردن و نواوانی خۆیان لە وشەکانی کتێبی پیرۆز بۆ هەموو لایەك سەلماندووە.**

**ئەو کتێبانەی کە مەسیحییەکان بە(پیرۆز)یان دەزانن پێکهاتووە لە 66کتێب_بەش_، کە لە یەك بەرگدا کۆکراوەتەوە و بەهەمووی دەوترێت(کتێبی پیرۆز). کتێبی پیرۆز لە دووبەش پێك هاتووە بە ناوەکانی(پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێ)، لەبارەی ئەم دوو بەشەوە بەشێوەیەکی جیا لە یەکتر قسە دەکەین.**

**بەشی یەکەم: پەیمانی کۆن:**

**ئەم نوسراوە پێکهاتووە لە 39کتێبی جیاجیا، هەموو ئەم 39بەشە، بە ناونیشانی کتێبی پیرۆز مایەی پەسەندی یەهودی و مەسیحیەکانە. ئەم کتێبە بەزمانی عیبری لەلایەن نوسەرانی جیاوازەوە_پەیامهێنەران_لە ماوەی هەزارساڵ زیاتردا نوسراون و کۆکراونەتەوە. پێنج کتێبی سەرەتا بەناوی (تەوراتTorah) یان (کتێبیەلی پێنجانە) ناسراون. داخوازی و فەرمایشتەکانی نێو ئەم پێنج کتێبە_واتە تەورات_ لەلایەن موسا و کۆمەڵێك کەسی ترەوە کە بەهۆی خوداوە هیدایەت دەدران لە سەنەدی کۆندا کۆکراونەتەوە و نوسراون.**

**یەکەم بەشی ئەم 39 کتێبە ناوی(پەیدابوونـ)ـە، بەشی پەیدابوون باسی ئافراندنی جیهان بەهۆی خودا، باسی ئادەم و حەوا و تۆفانی نوح مان بۆ دەکات. هەروەها بۆمانی دەگێڕێتەوە چۆن ئیبراهیم بە فەرمانی خودا نیشتمانی خۆی کە (عێراق)بوو بەجێهێشت و ڕووی لە سەرزەمینی (فەلەستین)کرد، ئەو سەرزەمینەی خودا گفتی بە ئیبراهیم دابوو پێی ببەخشێت.**

**هەروەها باسی ژیانی ئیسحاق و یەعقوب و یوسفیش دەکات، کە بەهۆی براکانیەوە بە غوڵامی لە میسر فرۆشرا و لە دوایدا بە کەرەمی خودا بویە وەزیری فیرعەون. چوار کتێبەکەی تری تەورات(یان چوار بەشەکەی تری تەورات) پێمان دەڵێت خواوەند بە چ شێوەیەك، هێزی بە موسـا بەخشی تا گەلی ئیسرائیل، کە لە بنچەی دوانزە ڕۆڵەکەی (یەعقوب/ئیسرائیل)بوون، ڕابەرایەتی بکات.**

وەچلۆن (بەنزیکەیی لـە 1300پێش زایـین) ئەوانی لـە میسر شوێن خۆی خستووە و گەڕاندونیەتەوە بۆ سەرزەمینی فەلّەستین.

ئەم کتێبانە لـەخۆگری تەواوی ئەو یاسایانەیە خودا لـە کێوی سینا بەهۆی موساوە بە گەلی خۆی(ئیسرائیل)ی بەخشی. دوای تەورات، چەند کتێبێکی مێژووی بوونیان هەیە، کە ڕوونی دەکەنەوە بۆمان چۆن گەلی ئیسرائیل لـە ژێر ڕابەرایەتی کردنی (یوشە ع ئبن نون) فەلّەستین فەتح ئەکەن و بە چ شێوەیەکیش خودا(ساموئیل)ی پەیامهێن دەنێرێت تا (لـەنزیکی 1000ی پێش زاین) داود بە ناونیشانی پاشا و سەروەری ئیسرائیل مەسح بکات. ئەم کتێبانە ڕوونی دەکەنەوە بۆ ئێمە، کە داود هەم پاشا بوو هەم پەیامهێن، وە بۆمان دەگێڕێتەوە داود بەچ شێوەیەك توانی هەموو دوژمنانی خۆی شکست پێ بێنێت و بەچ شێوەیەکش کوڕەکەی(سلێمان) پەرستگایەکی بۆ پەرستشی خودا لـە ئۆرشەلیم چێکرد. دوای سلێمانی پەیامهێن، وڵات بە سەر دووبەشدا دابەشبوو ڕۆڵـەکانی ئەو سەر بە قەبیلـەی یەهودا لـە ئۆرشەلیمدا فەرمانڕەوایان کرد تا لـەکۆتایدا ئۆرشەلیم لـە (ساڵی586ی پێش زایین) لـە ڕێگای سوپای پادشای بابلـەوە گیرا. زۆرێك لـە یەهودییەکان بە ئەسیری برانە عێراق و ئێران و دوای 50ساڵ (کورش)پادشای ئێران بابلی گرت، یەهودییە ئەسیرەکانی هاندا و ڕێگای بۆخۆش کردن تا بگەڕێنەوە بۆ ئۆرشەلیم و پەرستگای خودا کە وێران بوو بوو، سەرلـەنوێ دروست بکەنەوە. وە ئەوانیش ئەم کارانەیان ئەنجامدا، بەڵام دوای(586ی پێش زایین) ئیتر پادشایەك لـە بنەچەی داود، فەرمانڕەوای نەکرد و فەلّەستین لـە ژێر فەرمانڕەوای بێگانەکاندا بوو.

دوای کتێبە مێژوویەکانی پەیمانی کۆن، سرودەکان دێن بەم ناوانەی خوارەوە:

–نوسراوەکانی ئەیوب

–زەبوورەکانی داود

–نمونەکانی سولـەیمان

دوای ئەمانەش بە 16کتێبی تر دەگەین کە بە قەڵەمی پەیامهێنەرانی جیاواز نوسراون پێك هاتووە لـەمانە: ئەیشایا، ئەرمییا، حزقیال، دانیاڵ، میکا، زەکەریا و مەلاکی. زۆربەی ئەم پەیامهێنەرانە لـەنێوان ساڵەکانی 800تا 400ی پێش زایین، لـە یەهودیا[64] ژیانیان بردۆتەسەر. وا دەردەکەوێت دوای پەیامهێن مەلاکی[65] (بەنزیکی 430پێش زایین) تا زەمانی دەرکەوتنی یەحیایی لـەئاوهەڵکێش لـە نزیکی 26ی زایینی، خودا پەیامهێنەری تری نەناردبێت.

بەشی دووەم: پەیمانی نوێ

[64]ناوی ناوچەیەکی فەلّەستینە کە دەکەوێتە خوارووی ڕۆژهەڵاتی شاری یافا.

[65]ناوی یەکێکە لەپەیامهێنەکانی یەهود و یەکێکە لەپەیامهێنەکانی خودا.

**ژمارەی ئەو کتێبانەی کە پەیمانی نوێ پێکدەهێنن 27کتێبن.**

**ئەم کتێبانە بەزوانی یۆنانی بەهۆی زیاتر لە 10 نوسەری جیاوازەوە لە ماوەی 50ساڵ دوای مەرگ و هەستانەوەی عیسای مەسیح نوسراوەتەوە.**

**پەیمانی کۆن، مەبەست لەو پەیمانەیە کە خودا بەهۆی موساوە بۆگەلی ئیسرائیلی نارد، هەروەك لە کتێبی پیرۆزدا ئاماژەی بۆکراوە[66] پەیمانی نوێش مەبەست لەو پەیمانەیە کە خودا بۆ گەلی نوێی خۆی ناردوویەتی، گەلی خۆی مەبەست لە هەموو مرۆڤایەتییە، پەیمانی نوێ ئەو پەیمانەیە، خواوەند لەگەڵ هەموو مرۆڤایەتی بەستی بەخوێنی عیسای مەسیح، بۆ ئەو کەسانەی ناردووە کە بە عیسای مەسیح باوەڕدەهێنن، هەروەك نوسراوە کە:**

**"دوای نانخواردن، عیسای مەسیح جامی هەڵبڕی و وتی: (ئەم جامە بریتییە لە پەیمانی نوێ، کەبەخوێنی من دروست دەبێت، ئەو خوێنەی لە پێناوتان دەڕژێ..."[67]**

**چوار کتێب(بەش)ی یەکەمی پەیمانی نوێ بە(ئینجیل) ناودەبرێت، ئەم چوار بەشە بە زمانی یۆنانی بەمانای (مزگێنی باش و دڵپەسەند) دێت. ئەم کتێبانە لە ڕێگای 4نوسەری جیاوازەوە نوسراون[68] و هەرکام لەم نوسەرانە لەبارەی ژیان و فێرکارییەکانی عیسای مەسیحەوە نوسیویانە. ئەم ئینجیلانە لەگەڵ یەکتر هیچ دژیەکیەکیان نییە، بەڵکو تەواوکەری یەکترین، وەك ئەوەن کە چوار مرۆڤی جیاواز لە چوار ڕوویی جیاوازەوە وێنەی مرۆڤێکیان گرتبێت.**

**پێنجەمین کتێب(بەش)ی پەیمانی نوێ (کرداری نێردراوانە/اعمال رسولان). ئەم کتێبە بە دەرکەوتنی عیسای مەسیح بۆ قوتابیەکانی دەست پێ دەکات دوای هەستانەوەی لە نێو مردووان، دوایی بۆمان ڕووندەبێتەوە کە چۆن لەماوەی 30ساڵدا مزگێنی مەسیح بڵاودەبێتەوە، لە قودسەوە تا ڕۆما. کتێبی کرداری نێردراوان، بەتایبەت کاریەلی دوو کەس لە نێردراوانی مەسیح (واتە پەترۆس و پۆڵس) باس دەکات و ڕوون دەکاتەوە.**

**ئەوجا دوای ئەمە دەگەین بە21نامە کە زۆربەیان لەلایەن پۆڵس ی پەیامهێن، پەترۆس ی پەیامهێن و یوحەنا ی پەیامهێنەوە نوسراون. ئەم نامانە بۆ گروپەکانی مەسیحی و هەندێ لە شارەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم یان بۆ تاکە کەسی**

---

[66] (ئینجا بە مووسا فەرمان درا کە سەربکەوێت بۆلای یەزدان، خۆی و هارون و ناداب و ئەبیهو و حەفتا لە پیرانی ئیسرائیل، وە لە دوورەوە کڕنۆش ببەن، بەڵام ئەبێ تەنها مووسا لە یەزدان نزیك ببێتەوە، ئەوانی دیکە نزیك نەکەونەوە، خەڵکەکەش لەگەڵی سەرناکەون. دواتر موسا هات و هەموو وشەکانی یەزادان و هەموو یاساکانی بۆ خەڵکەکە گێڕایەوە، هەموو گەلیش بەیەك دەنگ وەڵامیان دایەوە و گوتیان: هەموو ئەو وشانەی یەزدان فەرموویەتی دەیکەین. مووساش هەموو وشەکانی یەزدانی نوسیەوە، بەیانی زوش هەستا قوربانگایەکی لە بن کێوەکە بنیاتنا لەگەڵ 12ستوون بۆ 12هۆزەکەی ئیسرائیل، لاوانی نەوەی ئیسرائیلیشی نارد و قوربانی سوتاندن و قووربانی هاوبەشیان لە جوانەگاکان بۆیەزدان پێشکەش کرد، موسا نیوەی خوێنەکەی لەناو جامێك کرد، نیوەکەی دیکەشی بەسەر قوربانگەکەدا پرژاند، ئینجا پەرتووکی پەیمانەکەی هەڵگرت و بۆ گەلی خوێندەوە، ئەوانیش گوتیان: هەموو ئەوەی یەزدان فەرموویەتی دەیکەین و گوێی لێ دەگرین، ئینجا موسا خوێنەکەی هەڵگرت و بەسەر گەلدا پرژاندی و گوتی: ئەمە خوێنی ئەو پەیمانەیە_مەبەست لەم قسەیە ئەوەیە: ئەم خوێنە لەوکاتدا نیشانەی پەیمانبەستنی یەزدان بووە لەگەڵ گەلی ئیسرائیل_ کەیەزدان لەگەڵتانی بەستووە بەگوێرەی ئەو وشانەی بۆم خوێندنەوە. ﴿دەرچوون**24/1**تا**9**﴾

[67] ﴿لۆقا**22/20**تا**21**﴾

[68] مەبەستی(مەتا و مەرقۆس و لۆقا و یوحەننا)یە.

تایبەت نوسراون. لەم نامانەدا ئەوە ڕونکراوەتەوە مەسیحییەکان دەبێ بەچ شێوەیەك باوەڕداربن و باوەڕبهێنن، بە چ شێوەیەکیش دەبێ بژین. کۆتا کتێب (ئاشکراکرنـ)ـە، ئەم بەشە بەحەوت نامە دەست پێ دەکات بۆ کۆمەڵەی بڕواداری هەرێمی ئاسیای ڕۆمانی، تێیدا لە شێوەی بینینی ڕەمزی، خواست و کرداری خواوەند لەسەر زەوی ڕادەگەیەنێت، هەروەها بەیانی دەکات کە چ سزایەك چاوەڕێی بێ باوەڕانە و هەروەها گفتی پیرۆزی و گەشتن بە پادشاهێتی ئاسمانی هەمیشەی بە هاوەڵان و ئەو کەسانەدەدان کە باوەڕیان هێناوە بەعیسای مەسیح.

ئەگەر چی هەم یەهودییەکان و هەم مەسیحییەکانیش کتێبەکانی پەیمانی کۆن بە بەرهەق و ڕاست دەزانن بەڵام زۆرێك لە یەهودییەکان پەیمانی نوێ بە پەیمانێك نازانن کە لەلایەن خواوەندەوە بۆ مرۆڤ نێردرابێت.

لەوانەیە لێرەدا بپرسن: باشە مەبەستی مەسیحییەکان لەوە چیە کە دەڵێن ئەمە (کتێبێکی پیرۆز)ە، یان ئەمە نوسراوەێکە (لەلایەن خواوەند)ەوە بۆمان دابەزێنراوە؟

بەر لە هەموو شتێك ئەوە باڕوون بێت لاتان، ئێمەی مەسیحی باوەڕمان وانییە، وەك چۆن بەڕێوەبەری فەرمانگەیەك بەشێوەیەکی ڕێنوسی و ئیملایی، سەر قەڵەمەکەی بەنوسینی نامەیەك ڕادەسپێرێت، خوداش بەم شێوەیە نوسەرە جیاوازەکانی ئەم کتێبەی بۆ نوسینەوەی بابەتەکانی ڕاسپاردبێت، چونکە کاتەك کە ئەم کتێبە جیاوازانە دەخوێنینەوە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە لە ڕووی ڕەوش و شێوازی نوسینەوەوە، جیاوازییەکی بەرچاویان هەیە. داودی پەیامهێن بەشێوەی سلێمان نییە نوسراوەکەی و هەروەها تایبەتمەندی نوسراوەکانی پۆڵس لەگەڵ یۆحەنادا جیاوازیان هەیە. لەم کاتەدا ڕێی تێدەچێت ئەم پرسیارە بێتە پێش و بپرسن: ئایا ئەو کتێبانە کە لەلایەن مرۆڤەوە نوسراوە، وەکو کتێبەکانی تر کە خەڵکی ئاسایی نوسیویانە لەخۆگری هەڵە نابن؟ چوون مرۆڤ نوسیویتی و مرۆڤیش ڕێی تێدەچێت هەڵە بکات؟

نەخێر بەهیچ جۆرێك بەم شێوەیە نییە، ڕاستە ئەم کتێبانە بەهۆی مرۆڤەوە نوسراوە، بەڵام مەسیحیەکان ئەم نوسراوانە، بە وشەی خودا دەزانن، باوەڕیان وایە خودا بەهۆی ڕۆحی خۆیەوە بەشێوەیەك ئەم نوسەرانەی هیدایەت داوە و چاودێری کردوون کە نوسراوەکانی ئەوان دووربێت لە هەر دەستکاری و هەڵەیەك، ئێمەی مەسیحی باوەڕمان وایە کە خودا هەقیقەتەکانی خۆی و ئیرادەی پیرۆزی خۆی بە پەیامهێنەران ناساندووە تا ئەوان بتوانن پەیامی ئەو بەگوێی خەڵکی بگەیەنن، هەر بەم ڕێگەیە خودا حەقیقەت خۆی بەو کەسانە نیشانداوە و ڕێنوێنی ئەوانەی کردووە کە ئەم کتێبانەیان نوسیوەتەوە.

هەریەك لە نوسەرانی ئەم کتێبانە بە قەڵەمی خۆی و بەتایبەتمەندییە مرۆییەکانی خۆیەوە لە ژێر چاوێری و دەسەڵات و ڕێنمایی ڕۆحی خودادا کەلامی خودای بۆ ئێمە نوسیوەتەوە. لە کتێبی پیرۆزدا نوسراوە کە:

" لەسەروو هەمووشتێکەوە ئەوە بزانن، کە هیچ پێشبینییەك لە نوسراوە پیرۆزەکاندا بە لێکدانەوەی خودی پەیامهێنەرەکە نەنوسراوە، چونکە هەرگیز پێشبینی بە خواستی مرۆڤ نەهاتووە، بەڵکو ڕۆحی پیرۆز ڕابەرایەتی مرۆڤەکانی کردووە، بۆ

**ئەوەی پەیامی خواوەندی ڕابگەیەنن..."[69]**

**ئەوان پەیامی خودایان بەیانکرد و هەروەها ئەو نوسراوانەیان نوسیەوە، کتێبی پیرۆز کەلام و وشەی خودایە لای ئێمە. کەواتە ئێمەی مەسیحی باوەڕمان وایە، کتێبی پیرۆز تەواو جیاوازی هەیە لەگەڵ هەموو کتێبەکانی تری جیهان، ئێمە باوەڕمان وایە کە هەرشتێك بمانەوێت سەبارەت بە خواوەند و ویستی وی بزانین لەنێو کتێبی پیرۆزدا دەیدۆزینەوە و لە ڕێگای ئەم کتێبەوە ئەو کردەوانەی کە خودا لێمانی خواستووە و زۆر شتی تر بۆژیانمانی لێ دەربێنین و بەباشی لە زۆر شتیش تێبگەین، هەروەها ئەم کتێبانە سەبارەت بەعیسای مەسیح و ڕزگاریکار قسەمان بۆ دەکات، کە تەنها کەسێکە دەتوانێت مرۆڤی گوناهکار بگۆڕێت و دنیا بەشێوەیەك لێ بکات کە خواوەند ویستی وایە بەو شێوەیە بێت.**

**ئێستا هەندێ شت بۆ ئێوە کوڵك و موش دەکەم و شی دەکەمەوە :**

**1-یەکەمین خاڵ ئەوەیە هەرچەندە لە تەواوی جیهاندا دەستە و ڕێڕەویەلی جیاواز جیاواز بونیان هەیە، بەڵام هەموو ئەم ڕێڕەوانەی مەسیحیەت باوەڕدارن بەوەی ئەم کتێبانە دروست و ڕاستن، وە ئەم کتێبانە ڕێنمایی تایبەتن بەتاکەکان لە بارەی باوەڕیەل و چۆناوچۆنی ژیان گوزەراندنێك کە وەك ئەوە بێت خواوەند داوای دەکات، هەموو دەستەوگروپەکانی مەسیحیەتیش لەسەر ئەمە کۆکن.**

**2-مەسیحییەکان هەرگیز باوەڕیان نییە بەوەی ئەو کتێبانەی کە هاتوون، کتێبەکانی دوای خۆیان سڕیبێتەوە و ڕەتکردبێتەوە، یان شوێنی ئەوانیان گرتبێتەوە، بۆنمونە: ئینجیل جێگای تەوراتی گرتبێتەوە یان تەوراتی ڕەتکربێتەوە، نەخێر... وەك عیسای مەسیح فەرمووی:**

**"وا بیرنەکەنەوە من هاتووم تەورات یان نوسراوی پەیامهێنەرانی تر بسڕمەوە، نەهاتووم بۆ سڕینەوەیان بەڵکو هاتووم بۆ تەواو کردنیان..."[70]**

**هەر بەو شێوەیەی لە قوتابخانە زۆربەمان بینیومانە و دەزانین کە کتێبەکانی پۆلی 12کتێبەکانی پۆلەکانی خوارتری خۆی ڕەتناکاتەوە، بەڵکو تەواوکەری هەموویانە، بەهەمان شێوە کتێبەکانی دیکە لەلایەن خواوەندەوە بەخشراون بە مرۆڤایەتی کتێبی پێش خۆی یان دوای خۆی ڕەتناکاتەوە، بەڵکو ناسین و ئاشنایمان بە هەقیقەتە گەوهەریەکانی خواوەند کاملتر و پوخت تر و جوانتر دەکات.**

**کەوابوو ئێمەی مەسیحی تەواوی ئەم کتێبانە دەخوێنینەوە و لێیان دەکۆڵینەوە تا هەموو ئەو فەرمانانەی خودا بەسەر ئێمەیدا داوە بە شێوەیەکی دروست و ڕێك و پێك ئەنجام بدەین. ئەگەر کەسێك کتێبێك بنوسێت و بەفەرمایشتەکانی خودا لە کتێبی پیرۆزدا هاوئاهەنگ نەبێت، بۆ ئێمە زۆر ڕوون دەبێت و هەر زوو دەزانین کتێبی ئەو کەسە لەلایەن خواوەندەوە**

---

[69] ﴿دووەم پەترۆس1/20و22﴾

[70] ﴿مەتا5/17تا18﴾

نەبووە و نییە، چونکی خودا هەرگیز پێچەوانەی وتەیەکی، وتەیەکی تر نافەرموێت.
3-ئەگەر بە ئێوەیان گوتبێت ئێمەی مەسیحی کتێبەکانی خۆمان دەستکاری کردووە و شتمان بۆزیاد و کەم کردووە، ئەو کتێبەی کە ئێستا لە پێش دەست مەسیحییەکانە، گۆڕاوە و هیچ گرنگی و بایەخێکی پیرۆزی پێوە نییە، ئەوا دەبێ بە ئێوە بڵێم کە بەداخەوەین بۆ ئەم جۆرە قسانە، وە بەهیچ شێوەیەك ئەم قسانە پایە و ئەساسێکیان نییە، وەپشت ئەستوور نین بە هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو. مەسیحییەکان کتێبی پیرۆزی خۆیان خۆش دەوێت و هەرگیز بە هیچ هێزێکی بەدکار ڕێگانادەن ئەو وشە پیرۆزانە دەستکاری بکات یان لەناویی بەرێت، سەرەڕای ئەمەش ئەمرۆکە نوسخەگەلی کتێبی پیرۆز بەزمانی یۆنانی بوونیان هەیە کە دێرینیەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ 1600ساڵ پێش ئێستا، پاچەڤەکردنی ئەو ئینجیلانەی ئێستا لەنێو جیهاندا باون و مەسیحییەکان بەکاری دەهێنن هەمان وشە و نوسراوی نوسخە دێرینەکانە.
خواوەند کەلامی خۆی بە هەموو جۆرەکانی مرۆڤ بەخشیوە، مەسیحییەکان کۆشێکی ڕەوانیان کردووە بۆ ئەوەی تەواوی کتێبی پیرۆز یا بەشێك لە کتێبی پیرۆز بە هەموو زوانە جیهانییەکان پاچەڤەبکەن تا هەموو کەسێك بتوانێت بە زمانی دایکی خۆی بیخوێنێتەوە. کتێبی پیرۆز یان هەندێ بەشی کتێبی پیرۆز (واتە لەوانەیە بەتەنها ئینجیلیش کرابێت و پەیمانی کۆنی تەکا نەبێ) بۆ نزیکەی 1500زمان و شێوە ئاخافتنی جیاواز لە جیهاندا پاچەڤەکراوە و بڵاوکراوەتەوە، لە هەموو زمانەکاندا پەیامی کتێبی پیرۆز کە پەیامی خواوەندە یەك جۆرە.
سالآنە زۆرتر لەهەر کتێبێك، کتێبی پیرۆز لە جیهاندا چاپ دەکرێتەوە و بڵاودەکرێتەوە، بەدڵنیاییەوە گەر خەڵکی بیانزانیایە ئەم کتێبە پڕ لە درۆ و نادروستییە، هەرگیز هێندە خواستی لەسەر نەدەبوو، چوون خەڵك هیچ ناچار نین بەم شێوە زۆرە ڕووبکەنە کتێبێك کە پڕبێ لە درۆ و ناسازگاری و شتی دەستکاری کراو، دواتر زۆر ڕێ تێنەچوو و مایەیی قبوڵ نەکردنە، خواوەندی بەتوانا کەلامی خۆی بۆ ڕێنمای و بەرچاو ڕۆشنی بەمرۆڤ ببەخشێت و دوایش مۆڵەت بدات دەستکاری بکەن، تا مرۆڤەکان گومڕابکات! نەخێر خودا بۆخۆی، کەلامی پیرۆزی خۆی هەزاران ساڵە لەهەر دەستکاری و شت خستنە سەر و گۆڕانکارییەکی مرۆییانە پاراستووە، وە بۆ هەمیشەش دەیپارێزێت. لەم ڕووەوە بۆ ئێمە ئەم کتێبە بەتەواوەتی مایەی وەج و ڕێزە و بەهەموو یەقینمانەوە کتێبی خوداوەندی و باوەڕپێکراوی ئێمەیە.
4-یەکێ لە خاڵە سەرسوڕهێن و بێوێنەکانی 66کتێب(بەش)ی کتێبی پیرۆز ئەوەیە کە ئەگەرچی لەلایەن نوسەرانی جیاواز و زمانگەلی جیاواز لە ماوەیەکی 1500ساڵیدا نوسراون بەڵام پەیامی هەموو ئەمانە یەکێکە و دژی یەکتر نین، ئەم کتێبانە وەك لە پێشتردا وتمان هەمووی لەیەك کتێبدا کۆکراونەتەوە، پێمان دەڵێن خودا کێیە، وە چی لەمرۆڤ دەوێت و وە بۆ مرۆڤە گوناهکارەکان چ ڕێگا چارەیەکی داناوە و بۆ مرۆڤە چاکەکارەکانیش چ پاداشتێکی گەورە، ئەمەش نیشاندەری ئەوەیە نوسەر و ئیلهامدەری ڕاستەقینەی نوسراوەکانی نێو ئەم کتێبە خواوەندە نەك ئەو مرۆڤانەی کە وشەکانیان نوسیوەتەوە.

5–خاڵێکی گرنگی تر سەبارەت بەکتێبی پیرۆز ئەوەیە، کە تێگەشتن لـە داخواستەکانی نێوی ئاسانە و جێبەجێکردنیش گونجاوە، ئەگەر چی ساڵانێکی زۆر پێش ئێستا بەزوانگەلی دێرین نوسراوە، بەڵام دەتوانرێت بەهەر زمانێك هەنوکەی کە هەیە لـەسەر ڕووی زەوی پاچەڤەبکرێت، وە هەر تاکێکی تازە فێری خوێندنەوە بوو دەتوانێت لـە مەبەستەکانی نێوی تێبگات، من زۆر جار لـەنزیك خۆم و لـە دوورترین شوێنی جیهان بیستوومە و بینیومە کە هەندەك ژن و پیاو هەبوون بەبێ هیچ مامۆستایەك تەنها بە خوێندنەوەیەکی بەشێکی کتێبی پیرۆز، خواوەندی ڕاست و بەرهەقیان ناسیوە و لـە گوناهەکانیان ڕزگاریان بووە.

ئەڵبەتە پیاوانی ڕۆحانی و شارەزایانی ئاینی مەسیحی چەندین ئاسانکاری و ڕێنوێنیان سازکردووە بە ئەمانەتەوە و لـە ڕێگای شورا و گفتوگۆکرنەوە و چەندین باوەڕنامەیان نوسیوە و بڵاویان کردۆتەوە تا ڕێگای ڕاست و حەقیقەت بە ئیمانداران نیشان بدەن، بەڵام بە شێوەیەکی ئاسایی ئەگەر کەسێك کتێبی پیرۆز بە جوانی بخوێنێتەوە ولـەسەری بەڕاستی بوەستێت، بۆی دەر دەکەوێت کە ئەم کتێبە داخوازیەکانی تەواو ڕوونن و هیچ شتێکی پێچاوپێچ و قورس باس ناکات لـە(داواکاریەکاندا بەتایبەت) تالێی تێنەگەیت.

کتێبی پیرۆز ئەو شتانەی پێویستمانە بۆ ناسینی خواوەند فێرمانی دەکات و زانیاری پێویستمان لـە بارەی ڕزگاربوون و ئەرکی ئێمە لـەهەمبەر خواوەند و مرۆڤدا پێدەبەخشێت، کەوابوو هەر تاکێکی مەسیحی ئەو ئەرکەی لـەسەر شانە کە کتێبی پیرۆز بەجوانی و بەوردی بخوێنێتەوە و لـە وشەکانی ورد بێتەوە، بە یارمەتی کەسانی شارەزا و هاوئاینی خۆی و بە ڕێنوێنی ڕۆحی پیرۆز ئەم کتێبە بۆخۆی  تەفسیر بکات و شیبکاتەوە. زۆرێك لـە مەسیحییەکان وا خوییان گرتووە کە هەر ڕۆژێك، گەر بەشێکی کەمیش بوبێت لـە کتێبی پیرۆز بخوێنێتەوە و لـە سایەی فێرکاریەکانی ئەم کتێبەوە زیاتر تێبگات و دونیابینی دروستی خۆی و ڕەوتی تێفکرینی زیاتر برازێنێتەوە.

لـەوانەیە سەرتان سوڕمابێت یان دەستی کەم قسەکانمتان گرتبێت و وتبێتتان کە بۆچی هیچ باسی ئەوە ناکات کتێبی پیرۆز لـەلایەن عیسای مەسیحەوە نوسرابێت یاخود لـەلایەن خواوەندەوە بەخشرابێت بە عیسای مەسیح...

لـەڕاستیدا تا ئەو شوێنەی کە ئاگادارم، عیسای مەسیح هیچ جۆرە کتێبێکی نەنوسیوە، وە هیچ کتێبێکیش لـەنێو دەستەکانی نەبووە کە لـەلایەن خواوەندەوە بە ئەو بەخشرابێت. بەشێوەیەك دواتر ڕوونی دەکەمەوە، ئەو خۆی کەلامی زیندووی خودا بوو، خودا لـە ڕێگای کەسایەتی و کردەوە و فەرمایشتەکانی ئەو تەك مەردمدا قسەی دەکرد، ئەو تەجەلی و خۆنوێنی و دەرکەوتنێکی تەواوەتی خواوەند بوو لـەم ڕووەوە (مەتتا و یوحەننا و پۆڵس و ...هەندێ تر لـە شاگردان)ی هیدایەت دا تا ئەم کتێبە کە وێنەدانەوەی وشەکانی عیسای مەسیحە بۆ ئێمە بنوسن.

ئەم کتێبانە یاوەری ئێمە دەکەن تا سیما و چارەی عیسای مەسیح ببینین، پەیامی خواوەندی کە بەهۆی عیسای مەسیحەوە بە ئێمە گەشتووە بە باشی گوێمان لێ بێت و هەستیی پێ بکەین.

هاورێی خۆشەویستم...

بەم گوێرەیە ئەوەی نوسیومە بە باشی سەرنج بخەنە بانی و ببینین کە کتێبی پیرۆز گرنگیەکی فرەوفراوانی هەیە، وە لەسەر هەرکەسێك پێویستە کە ئەو کتێبە پیرۆزە بە باشی بخوێنێتەوە و گوێ بۆ ئاوازی داواکاری و پەندەکانی نێوی بگرێت، لەبەر ئەوەی بە دڵنیاییەوە دەلێم تەنها لە رێگای ئەو کتێبە پیرۆزەوە، ئێمە دەتوانین هەقیقەتی مەسیحیەت و رێگای رزگاریمان دەرك بکەین، بە هیوام هەرچی زووە گەر کتێبی پیرۆزتان لەپێش دەست نییە، دەستی خۆتانی بخەن و سەرەتاش (پەیمانی نوێ) بخوێننەوە و دواتر (پەیمانی کۆن) لەبەر ئەوەی دوای خوێندنەوە و تێگەشتن لە پەیمانی نوێ، باشتر لە مەبەستی پەیمانی کۆن دەگەن.

ئومێدەوارم کە خواوەند بەهۆی هەر پەرەیەکەوە لە کەلامی پیرۆزی خۆی لەگەڵتان ئاخافتن بکات و خۆیتان نیشان دات...پیرۆزبن

**(بەشی شەشەم)**

# عیسای مەسیح چۆن لەدایك بوو؟ چی کرد؟

**هاوڕێی هێژام**

**ئێستا ڕونکردنەوە لە بارەی گرنترین بەشی بیروباوەڕی مەسیحییەکان دەدەم، لەم بەشەدا باسی ئەوە دەکەم کە مەسیح کێیە، وە پەیوەندی مەسیح بە خواوەند و مرۆڤەوە چییە. بەڵام سەرەتا پوختەیەك لە بارەی ژیانی ئەوەوە لەسەر زەوی باس دەکەم کە لەنێو ئینجیلی پیرۆزدا باس کراوە.**

**لە ئینجیلی پیرۆزدا لەم بارەوە بەڕونی نوسراوە:**

**"جوبرەئیلی فریشتە لەلایەن خواوەندەوە نێردرا بۆ شارێك لە ناوچەی(جەلیل) بە ناوی (ناسیرە)[71]، چووە لای کچێکی نیشانەکراو لە پیاوێك ناوی یوسف بوو، لەبنەماڵەی داود، ناوی ئەم کچە پاکیزەیە، مریەم بوو. جوبرەئیل هاتە لای و پێی گوت:**

**(ئەی ئەو کەسەی بەرەکەتی خوداوەندیت بەسەردا ڕژاوە، سڵاوت لێ بێت خواوەندت لەگەڵە.)**

**مریەمی پاکیزە بە ووتەی فریشتەکە شێواو بیری کردەوە دەبێ ئەم جۆرە سڵاوکردنە چی بێت. فریشتەکە پێی گوت:**

**(مەترسە ئەی مریەم، خواوەند بەرەکەتی پێداویت، تۆ سکت پڕ دەبێت و کوڕێکت دەبێ ناوی دەنێیت عیسا. ئەو مەزن دەبێت، بەرۆڵەی خواوەند ناودەبرێت، خواوەندیش تەختی پاشایەتی داودی پێ دەبەخشێت. هەروەها تاهەتایە بەسەر ماڵبات و نەوەکانی یەعقوبدا فەرمانڕەوایەتی دەکات، پادشاهێتیەکەش کۆتایی نییە.).."[72]**

**ئەم ڕاستییە ئاماژە بوو لە ئەنجامی پێشگۆیی ئیشایای پەیامهێنەر پێش حەوت سەد ساڵ فەرمووبوی:**

**"پاکیزەیەك زکی پڕ دەبێت و لەو سکە کوڕێکی دەبێت.."[73] دواتر عیسای مەسیح لە شارێکی بچوکی نزیك ئۆرشەلیم**

---

[71] لەو سەردەمەدا زەوی فەڵەستین کرابوو بەسێ ناوچەی جیاواز، لەسەرەوە جەلیل ی ناو بوو، لەناوەڕاستەوە سامیرە، لەخوارەوە یەهودیا.

[72] (خوا جوبرەئیلی فریشتەی نارد بۆ شارێك لە ناوچەی جەلیل، کە ناوی ئەو شارە ناسیرە بوو، بۆلای پاکیزەیەکی مارە بڕاو لە پیاوێك لە بنەماڵەی داود کە ناوی یوسف بوو، ناوی پاکیزەکەش مریەم بوو، جوبرەئیل هاتە لای مریەم و گوتی: سڵاو ئەی ئەو کەسەی نیعمەتی خودات بەسەردا ڕژاوە، یەزدانت لەگەڵدایە. بەڵام ئەو بە پەیامەکە زۆر شێوا و بیری کردەوە، دەبێت ئەمە چ جۆرە سڵاوێك بێت. فریشتەکە پێی گوت: مەترسە مریەم، چونکە لای خودا ڕەزامەندیت بەدەست هێنا. ئەوەتا سکت دەبێت و کوڕێکت دەبێت، ناوی لێ دەنێیت عیسا، پایەبەرز دەبێت و بەکوڕی خودای هەرە بەرز ناودەبرێت، خودای پەروەردگاریش تەختی داودی باوکی پێ دەداتەوە، هەتا هەتایە حوکمڕانی نەوەی یەعقوب دەکات، شانشینەکەشی کۆتایی نایەت. بەڵام مریەم بەفریشتەکەی گوت: ئەمە چۆن دەبێ! من هێشتا پاکیزەم؟! فریشتەکەش وەڵامی دایەوە: ڕۆحی پیرۆز دێتە سەرت و هێزی خودای هەرەبەرز دەبێتە سایەی سەرت. لەبەری ئەوەی ئەو پیرۆزەی لێت دەبێت، بەکوڕی خودا ناودەبرێت، هیچ شتێك لای خودا مەحاڵ نییە. مریەمیش گوتی: من کارەکەری یەزدانم ئەوەی تۆ دەیفەرموویت بابێتە دی...فریشتەکەش بەجێی هێشت) ﴿لۆقا1/26تا38﴾

[73] (پاکیزەیەك سکی پڕ دەبێت و کوڕێکی دەبێت، ناوی لێ دەنێت ئیمانوێل_ئیمانوێل واتە: خودا لەگەڵمانە_) ﴿ئیشایا7/14تا15﴾

**بەناوی (بێت لەحم)[74] لەدایك بوو، بێت لەحم هەر ئەوشوێنەی کە داودی پەیامهێن دوو هەزار ساڵ لەوە و پێش تێیدا لەدایك بوو بوو. لەدایك بوونی عیسای مەسیح لە (بێت لەحم) پێش گۆی کرابوو لەلایەن ئیشایا ی پەیامهێنەرەوە، لە (میکا1تا5) دا نوسراوە:**

**" ئەی شاری سوپاکان**

**سوپاکەت کۆبکەرەوە**

**چونکە گەمارۆدراوین**

**بە گۆچان لە ڕوومەتی ڕابەری ئیسرائیل دەدەن**

**تۆ ئەی بێت لەحمی ئەفراتە**

**هەرچەندە لەنێو شارۆچکەکان(هۆزەکان)ی یەهود دا بچوکیت**

**بەڵام یەکێك لە تۆوە بۆمن دەردەکەوێت**

**ئەوە دەبێتە فەرمانڕەوای ئیسرائیل**

**ڕەچەڵەکی لە دێر زەمانەوەیە**

**لە ئەزەلەوەیە..."[75]**

**کاتی لەدایك بوونی عیسای مەسیح فریشتەیەك خەوەری دا بە هەندێك ڕێبوار و شوان کە لەنزیك بێت لەحم بوون، لەم بارەوە لە ئینجیلدا نوسراوە:**

**"لە نزیك بێت لەحم گەلەوان و شڤان هەبوون، کە لە دەشت و دەر دەمانەوە فریشتەیەك لەلایەن خودا هاتە لایان، نور و شکۆمەندی خودا درەوشایەوە لە دەور و پشتیان، بەمە ترسێکی زۆریان لێ نیشت. فریشتەکە پێی وتن:**

**( مەترسن، ئەوا من مزگێنییەکی خۆش و مەزنتان پێ دەدەم کە بۆ هەموو گەلە.**

**ئەمرۆ لە شاری داودی پەیامهێن ڕزگاری کارێك بۆئێوە لە دایك بوو**

**ئەویش مەسیحی خواوەندە..."[76]**

**مریەم نیشانەکرابوو بۆ (یوسفی دارتاش) و یوسفیش بە شێوەیەکی باش سەرپەرشتی عیسای مەسیحی لە منداڵیدا وە ئەستۆ گرت.**

**عیسای مەسیحیش لە کاتی جەحێڵیدا لە شاری(ناسرە) بەکاری دارتاشیەوە سەرقاڵ بوو. تا تەمەنی 30ساڵی هیچ**

---

[74] شارێکی بچوکە لە دووری هەشت کیلۆمەتر لە باشوری ڕۆژئاوای ئۆرشەلیم.

[75] ﴿میکا**1/5**تا**3**﴾

[76] ﴿لۆقا**2/8**تا**13**﴾

فێرکاریەکی نەدەدا بەکەس، هیچ پەرجوویەکیشی نیشان نەدەدا، خەڵکیش بەم هۆیەوە نەیاندەزانی ئەمە ئەو مەسیحەیە چاوەڕوانینی.

کە عیسا بویە 30ساڵ، کاتی ئەوە هات ئەو خزمەت و ئەرکەی پێی سپێردراوە لە جیهاندا دەست بە ئەنجامدانی بکات، بەم بۆنەیەوە (ناسیرە)ی جێ هێشت و چووە لای یەحیایی لەئاوهەڵکێش. لەم کاتەدا یەحیای پەیامهێن، پەیامی خودایی بە ڕێژەیەکی زۆری خەڵکی کە لە نزیکی جەم بوبوون دەگەیاند، ئەوانی بۆ تۆبەکردن بانگ دەکرد، ئەوانەی کە تۆبەیان دەکرد لە ڕوبارێکی (ئەردەن) بە نیشانەی پاك بونەوە لە گوناه، لە ئاو هەڵدەکێشران.

ئەگەر چی عیسای مەسیح لە هەموو ژیانیدا هەرگیز لە تاوانێکەوە نەگلابوو، داوای لە یەحیایی لە ئاوهەڵکێش کرد کە ئەو لە ئاو هەڵکێشێت، یەحیاش لەگوێی کرد. کاتێك عیسای مەسیح لەنێو ئاوەکە هاتەدەرەوە ڕۆحی خودا لەسەر شێوەی کۆترێکی سپی و جوان لە ئاسمانەوە دابەزییە سەرشانی عیسا و دوای ئەمە خێرا دەنگێکیش لە ئاسمانەوە هات، تەنها یەحیا و عیسای مەسیح گوێیان لێ بوو، دەنگەکە دەیگوت:

"ئەمە کوڕی خۆشەویستی منە، ئەو کوڕەی کە زۆر پێی دڵشادم..."[77]

لە دوایدا باسی مانای وشەی (کوڕ) دەکەین، بزانین مەبەست لەوە چییە خواوەند فەرموویەتی عیسای مەسیح کوڕی خۆشەویستی منە.

دوای ئەمە، عیسا ڕووی لە بیابان کرد و لەوێ بۆ ماوەی 40ڕۆژ بە ڕۆژوو بوو، لەو ماوەدا دوعای دەکرد، یادی کردگاری جیهانیانی دەکردەوە، لەم کاتەدا شەیتان هەموو هەوڵێکی خستبوویە گەڕ بۆ ئەوەی فریوی عیسای مەسیح بدات، بەڵام شکستی هێنا، هەروەك لە ئینجیلی پیرۆزدا لەم بارەیەوە نوسراوە کە:

" عیسای مەسیح بەهۆی ڕەوانی پیرۆزەوە بردرایە دەشت و دەر، تاوەکو شەیتان تاقیبکاتەوە، دوای ئەوە چل ڕۆژ بەڕۆژوو بوو، زۆری برسیبوو، ئەو دەم شەیتان وەك تاقی کەرەوە، هاتە پێشی و پێی وت: (ئەگەر تۆ ڕۆڵەی خواوەندیت بەو بەردانە بڵێ ببن بەنان).

عیسا وەڵامی دایەوە و وتی: (مرۆڤ تەنها بەنان ناژی، بەڵکو بەو وشانەش دەژی کە لە دەمی خواوەندەوە دێتەدەر.)

ئینجا لەلایەن شەیتانەوە بەرەو شاری پیرۆز برا، عیسای لە قەراغ سەربانی پەرستگا ڕاگرت و پێی گوت: (ئەگەر تۆ ڕۆڵەی خواوەندیت لێرەوە خۆت فڕێدە خوارەوە...چونکی نوسراوە کە: خواوەند لە ڕێی فریشتەکانەوە دەتپارێزێت و لەسەر دەستی وان هەڵتدەگرن نەبادا پێت وەبەردێك بکەوێت.)

عیسا بە شەیتانی گوت: (نوسراوە کە: خوداوەند خودات تاقی مەکەرەوە.)

دیسان لەلایەن شەیتانەوە برایە سەر لوتکەی چیایەکی زۆر بەرز و شەیتان بە جادووی خۆی هەموو مەزنێتی و پادشایەتی

[77] ﴿مەتا3/17﴾

جیهانی پیشانی عیسا دا و پێی گوت: ( هەموو ئەم سامان و پادشایەتی و دەسەڵاتە دەکەم بە موڵکی تۆ ئەگەر سەر دانەوێنیت و کڕنۆشم بۆ بەریت).

عیسای مەسیحیش پێی گوت: ( ئەی شەیتان لێم دوورکەوە چونکە نوسراوە کە : بۆخواوەند خودات کڕنۆش بەرە و تەنها ئەو بپەرستە.) دوای ئەمە شەیتان نائومێد بوو لە عیسا و وازی لێ هێنا..."[78]

عیسای مەسیح دوای سەرکەوتنی بەسەر وەسوەسەکانی شەیتاندا گەڕایەوە بۆلای یەحیای لە ئاوهەڵکێش. کاتێك یەحیا عیسای مەسیحی بینی بە شاگردانی خۆی وت :

"ئا ئەوەتا بەرخی خواوەند، ئەو قوربانیەیی کە تاوانەکانی جیهان هەڵدەگرێت، ئەمە ئەو کەسەیە کە دەربارەی قسەم بۆ کردن، ئەوەی لەدوای من دێت لەپێش من بوونی هەیە، چونکە ئەو پێش بوونی من بوونی هەبووە، منیش نەمدەناسی، بەڵام هاتووم بۆ لەئاو هەڵکێشان تا ئەو بۆ ئیسرائیل دەرکەوێ.

ئینجا یەحیا شایەتی داو گوتی: ( ڕۆحـــی پیرۆزم لە شێوەی کۆترێك بینی لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوە و لەسەر شانی عیسا نیشتەوە. من نەمدەناسی بەڵام ئەوەی منی ناردووە خەڵك لەئاو هەڵبکێشم، ئەو پێی گوتم: ئەوەی دەیبینیت ڕۆح دێتەخوارەوە و لەسەری جێگیر دەبێ، ئەو خەڵکی بە ڕۆحی پیرۆز هەڵدەکێشێت. لەبەر ئەوەی ئەمەم دیووە، شایەتی دەدەم ئەو ڕۆڵەی خواوەندە..."[79]

مەبەستی یەحیا لەوەی کە عیسای بە بەرخ ناوبردووە ئەوەیە کە عیسای مەسیح لە پێناو تاوانەکانی ئێمە دەبێتە قوربانی. لەدوایدا عیسا دەستی کرد بەهەڵبژاردنی شاگردان و لەنێوان ئەو کەسانەی شوێنی کەوتبوون 12کەسی هەڵبژارد کە لەدوایدا نازناوی(رسولان/نێردراوان)یان لێنرا، ئەم کەسایەتیانەی کە عیسای مەسیح هەڵیبژاردن خەڵکانێکی گەورە و زیرەك و ڕاهێنراو نەبوون، بۆنمونە (پترۆس و یوحەننا) ماسیگر بوون و مەتتاش باجگیر بوو. بەڵام ئەو کەسانەی کە عیسا هەڵیبژاردن باشتر لە هەمووان دەیانزانی ئەم کەسە هەمان مەسیحی چاوەڕوانکراوە، بەم هۆیەشەوە کاروبارە جۆراوجۆرەکانی خۆیان وازلێهێنا و بەبێ ئەوەی چاوەڕێی دەستکەوتی مادی وەك پارە و شـــت بن، مامۆستاکەی خۆیان_عیسای مەسیح_ یاوەری دەکرد و بۆماوەی 3ساڵ پەیڕەویان لێ دەکرد و بۆ هەموو شوێنێك پێ بەپێی دەڕۆشتن. لەم ماوەیەشدا عیسا، ئەوانی بۆ ئەو فەرمانانەی کە خواوەند پێی سپاردبوو ئامادە دەکرد و ڕای دەهێنان بۆ ئەو کاتەی کە بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان. پاشان عیساش هەروەك یەحیا دەستی کرد بە ئامۆژگارییە ئاینیەکان بۆ خەڵکی، لە بارەی ئەم سەرەتا و دەستپێکەی عیساوە لە کتێبی پیرۆزدا نوسراوە کە:

" کاتەکەی هاتووە و پادشاهێتی ئاسمان نزیك بۆتەوە

---

[78]﴿مەتا4/1تا11﴾

[79]﴿یۆحەنا1/29تا34﴾

تۆبە بکەن و وەرن باوەڕبهێنن بە مزگێنیم..."[80]

عیسای مەسیح بە هەموو شوێنێکدا دەگەڕیا، پەیامی خۆی لە پەرستگا و ماڵ بەماڵ و سەر چیا و دەشتایی و سەر بەرزاییەکان و کەنار دەریا(بەتایبەت دەریاچەی جەلیل) بەیاندەکرد و بەگوێی خەڵکی دەدا. هەرکەسێك کە فەمایشتەکانی ئەوی گوێ لێ دەبوو لە حیکمەت و تواناکانی بۆ بەیانکردنی مەبەستەکانی سەری سوڕدەما، چونکی ئەو هیچکات وەك پەیامبەرێك قسەی نەدەکرد و ڕێك بە چەشنی خودایی جیهانیان دەهاتەگۆ.

تەواوی پەیامهێنەران دەیان گوت: " گوێ بگرن خواوەند پێتان دەفەرمووێت.." بەڵام عیسای مەسیح هەمیشە دەیگوت: " من بەئێوە دەڵێم..." .

عیسا لەدوایدا دەستی کرد بە شیفادانی بیماران و ئەو نەخۆشانەی چارەسەر دەکرد کە دەهاتنە لایی، لە ڕێگەی وشەکانیەوە یان بەهۆی دەست لێ دانیانەوە ئەوانی چاك دەکردەوە. دەربارەی گیرۆدەبوویەك بە نەخۆشیەکی خراپ لە ئینجیلدا نوسراوە:

" گرفتارێك بە نەخۆشی گولی، هات و لە عیسای مەسیح پاڕایەوە و کەوتە سەرچۆك و وتی: (گەر تۆ بخوازی پاك دەبمەوە)

عیساش بەزەی پێدا هاتەوە و دەستی لێدا و وتی: (من دەمەوێت و هەرئێستا پاك ببەرەوە)

هەر کە ئەمەی فەرموو، کابرای گرفتار برینەکانی نەما و پاك بویەوە..."[81]

هەموو ئەو کەسانەی کە گیرخواردوو بون بەدەست ڕۆحی پیسەوە، هاتنە کن عیسای مەسیح و ئەویش ڕۆحە پیسەکانی لێ دورخستنەوە و ڕزگاری کردن، ڕۆشنای گەڕاندەوە بۆچاوی نابیناکان، لەمانەش گەورەتر و بێ وێنە تر چەند کەسێك کە مردبوون، زیندووی کردنەوە.

زۆرێك خەڵك بەم هۆیەوە شوێنی کەوتن، عیسا بە شێوەیەك سەرقاڵی ئامۆژگاری کردن و فێرکاری بوو، مەجالی نانخواردنیشی بۆنەمابویەوە، هەر بۆخۆشی هەمیشە لە پێویستییەکانی خۆی گوێی دەخەواند، لەبری ئەمە هەموو کاتێك خەریکی خۆشەویستی بەخشینەوە و پەروەردەکردن و شیفادان و هاوکاری کردن بەکەسانی تر بوو.

عیسا هەرگیز هیچ پەرجوویەکی بۆ بەرژەوەندی کاری خۆی ئەنجام نەدەدا، هەرگیزیش ئەو توانا زۆرانەی خۆی، بۆ لاف و گەزاف لێدان بەکار نەدەبرد. تەواوی کارو پەرجووەکانی عیسای مەسیح بۆ ئەوە بوو کە ئارامی و ئاسایش و ڕزگاری بۆ خەڵکی لێ قەوماو فەراهەمبکات و لەم ڕێگەیەشەوە خۆشەویستی خودا بۆ ئەوان ڕونبکاتەوە کە چۆنە.

ڕۆژێك کۆمەڵێك خەڵکی داماو و هەژاری بینی، بەم وشە جوان و بەنرخانە بانگی کردن بۆلای خۆی کە لە کتێبی

---

[80] ﴿مەرقۆس 15/1﴾

[81] ﴿مەرقۆس 40/2تا42﴾

پیرۆزیشدا نوسراوە:

" وەرن بۆلام ئەی هەموو ماندووان

وەرن بۆلام ئەی بارگرانەکان

منم کە دەتانحەسێنمەوە

نیری من بخەنە سەرخۆتان و لە منەوە فێربن

چونکە دڵنەرم و بێفیزم

لە لای من حەسانەوە بۆ دەرونتان دەدۆزنەوە

نیرەکەم گونجاوە و بارم سوکە..."[82]

هەرکەسێك کە دەهاتە لای عیسای مەسیح، بەنائومێدی و دڵشاکاوی نەدەگەڕایەوە.

جارێکیان پیاوێکی ئیفلیج هاتە لایی، چوار کەسی تر هەڵیانگرتبوو، عیساش زانی ئەم پیاوە پێش ئەوەی پێویستی بە چارەسەری جەستەی بێت پێویستی بە چارەسەری ڕۆحییە.

لەم بارەوە لە ئینجیلدا نوسراوە کە:

"کابرایەکی ئیفلیج کە بەچوارکەسەوە هەڵیانگرتبوو هێنایانە خزمەت عیسای مەسیح، بەڵام بەهۆی زۆری خەڵکەکەوە نەیان توانی لێی نزیك ببنەوە، ئینجا چوونە سەربانی ئەو شوێنەی کە عیسای مەسیحی تیابوو، سەربانەکەیان کون کرد و کابرایان بەنوێنەکەوە شۆڕکردەوە خوارەوە بۆبەردەمی، کاتێ عیسا بە مشێوەیە باوەڕیانی بینی بە کابرای وت:

( کابرا گوناهەکانت بەخشران)

لەنێوان ئامادەبوانی ئەو شوێنە، هەندێ مامۆستای شەریعەت هەبوو، لە دڵی خۆیاندا وتیان: بۆچی ئەم پیاوە بەم شێوەیە دەدوێت؟ بەمە کفر دەکات! کێ دەتوانێ لە گوناه خۆش بێت جگە لە خواوەند؟!

دەست بەجێ عیسای مەسیح بە ڕەوانی خۆی زانی چۆن لەدڵیاندا بیری لێ دەکەنەوە، پێی فەرموون:

( بۆچی ئاوها بیردەکەنەوە لە دڵتاندا؟! کامیان ئاسانترە؟! بە ئیفلیجێك بوترێت: گوناهەکانت بەخشرا، یان پێی بوترێ هەستە نوێنەکەت لابەرەو بڕۆ؟ من ئەمەم وت بەم کابرایە، بۆ ئەوەی بزانن ڕۆڵەی مرۆڤ لەسەر زەوی توانای گوناه بەخشینیشی هەیە.)

ئینجا بە کابرا ئیفلیجەکەی فەرموو:

(پێت دەڵێم هەستە جێگاکەت هەڵگرە و بچۆرەوە بۆماڵەوە.)

دەست بەجێ کابرا جێگاکەی هەڵگرت و لەبەردەم خەڵکەکەدا بەپێی خۆی ڕۆشت. بەمە هەموو سەرسام بوون،

---

[82] ﴿مەتا11/28تا31﴾

**ستایشی خواوەندیان کرد و وتیان هەرگیز شتی وامان نەدیووە!..."[83]**

**لەمە بەدوا زۆرێك لە ڕابەرانی ئاینی یەهود کەوتنە دوژمنایەتی کردنی عیسا، حەسودییەکی زۆریان دەبرد بەوەی کە عیسای مەسیح بە شێوەیەکی زۆر فراوان لەنێو خەڵکیدا خۆشەویست بوو بوو.**

**ڕابەرانی ئاینی یەهود ڕەخنەی زۆریان لە عیسا دەگرت، بۆ نموونە دەیان وت: ئەگەر لەلایەن خواوە ڕاسپێردرابێت لەگەڵ خراپەکاراندا گفتوگۆ ناکات و کۆنابێتەوە و تێکەڵی ناکات، وە ڕەخنەیان لێ دەگرت بەوەی کە لەڕۆژی شەممەندا(سەبت) کە یەکێك بوو لە ڕۆژە پیرۆزەکانی یەهود، نەخۆشەکان شفا دەدات و کار دەکات.[84]**

**جا هەر زوو ئەم ڕقەی ڕابەرانی یەهود و دارودەستەکانیان تەشەنەی سەند، وای لێ هات کە بڕیاربدەن بە کوشتی بدەن، لەم بارەوە لە کتێبی پیرۆزدا لە چەند شوێنێکدا نوسراوە کە:**

**" هەندێ مامۆستای شەریعەت هەبوو، لە دڵی خۆیاندا وتیان: بۆچی ئەم پیاوە بەم شێوەیە دەدوێت؟ بەمە کفر دەکات!..."[85]**

**" کاتێ مامۆستایانی شەریعەت و فەرسییەکان بینیان عیسا لەگەڵ باجگران و گوناهباران نان دەخوات، بەقوتابیەکانیان وت: بۆچی لەگەڵ باجگران و گوناهباران نان دەخوات!..."[86]**

**عیسای مەسیح ئاگاداری ئەم بابەتانە بوو، ئەو بەو هێزە گەورە و هاووێنەیەی خودا، دەیتوانی مردوو زیندووبکاتەوە و دەشیتوانی دوژمنە ڕق لە دڵەکانی خۆشی بە هیلاکدا ببات و نابووتیان بکات بەڵام هەرگیز کارێکی وای ئەنجام نەدا.**

**ئەو نەك هەر دوژمنانی خۆی خۆشدەویست، بەڵکو بە شاگردانیشی فەرموو دوژمنەکانی خۆیان خۆش بوێت، نزای چاکەیان بۆبکەن، بەو تەرزەی کە خۆی باوەڕی پێی هەبوو لە هەمبەر دوژمنانی، بوویە سەرمەشق بۆ شاگردەکانیشی تا ئەمە بکەنە یاسا بۆ خۆیان.**

**لەو زەمانەدا گەلی یەهود سەربەخۆ نەبوون و لەژێر ڕکێفی (ڕۆمـ)ـەکاندا بوون، یەهودییەکان خولیایەکی زۆریان هەبوو بۆ ئەوەی لەژێر دەستی ڕۆمەکاندا بێنەدەر و سەربەخۆی بە دەست بهێنن. کاتێك یەهودییە باوەڕدارەکان زانیان عیسای مەسیح توانیویەتی بە پێنج نان و دوو ماسی زیاتر لە پەنجا هەزار کەس لە بیابانێکی قاقڕدا تێربکات و نانیان بدات بە یەکسانی، هەوڵیان دا ئەو بکەنە پاشای خۆیان، هەروەك چۆن لەم بارەوە لە ئینجیلدا نوسراوە کە:**

**"عیسا پەڕییەوە ئەوبەری دەریاچەی جەلیل، ئینجا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی دوای کەوتن، چونکە نیشانە و پەرجووی**

---

[83] ﴿مەرقۆس**2/3**تا**13**﴾

[84] لای جولەکەکان ڕۆژێکی پیرۆزە، بەپێی شەریعەت لەو ڕۆژەدا هەموو جۆرە کارێك قەدەغەیە، تەنها بە خواپەرستی و نوێژ و خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز و فێرکاری ئاینی خەریك دەبن.

[85] ﴿مەرقۆس**2/6**تا**8**﴾

[86] ﴿مەرقۆس**2/16**تا**18**﴾

سەرسوڕهێنەریان لێ دەبینی. عیسا و قوتابیەکانی چونە سەرشاخێك و لەوێ دانیشتن. هەروەها جەژنی تێپەڕبوونی جولەکەکانیش نزیك بوو. کاتێك عیسا سەیری کرد وبینی ژمارەیەکی زۆر بەرەو ڕووی دێن، بە فیلیپۆسی فەرموو: (لەکوێ نان بکڕین تا نانی ئەم هەمووەی پێ بدەین؟) ئەمەی بۆیە وت تا ئەو تاقی کاتەوە، چونکە عیسا خۆی دەیزانی چی دەکات. فیلیپۆس وەڵامی دایەوە: گەر بایی 200دیناریش نان بکڕین بەشی ئەوەندە ناکات هەریەکێ لەم مرۆڤانە پارچەیەکی بچوکی بەرکەوێت! ئینجا ئەندەراوس برایی شەمعون پەترۆس، کە یەکێك بوو لە قوتابییەکانی پێی گوت: لێرە کوڕێك هەیە پێنج نانی جۆ و دووماسی پێیە، بەڵام ئەمە چییە بۆ ئەم گردە مەردمە؟

عیسا وتی : (دایان بنیشێنن!) خەڵکەکە کە ژمارەیان پێنج هەزار کەس دەبوو دانیشتن، عیسا نانەکەی هەڵگرت و سپاسی خواوەندی کرد، ئینجا هەرکەسە و بەپێی پێویستی خۆی نانی دانێ، دوو ماسیەکەشی هەروا لێکرد. کاتێك هەموو لایەك تێر بوون، بەقوتابییەکانی گوت: (ئەو لەتە نانانەی ماوەتەوە کۆی بکەنەوە تاوەکو هیچ شتێك بەفیڕۆ نەڕوات!) ئەوانیش کۆیان کردەوە، تەنها لەو پێنج نانە جۆیە، دوانزە سەبەتە بەس لێوارە نان مابوویەوە لە نانخۆران. دەمەك خەڵکەکە ئەو پەرجووە سەرسوڕهێنەرەیان بینی کە عیسا ئەنجامی دا، گوتیان: بەڕاستی ئەمە ئەو پەیامهێنەرەیە کە بۆ جیهانیان هاتووە. عیسای مەسیح کە زانیی خەریکن دەیکەنە پاشا، بە تەنها لەوێ هەڵهات و گەڕایەوە بۆسەرشاخ..."[87]

ئەوان دەیانزانی کە عیسای مەسیح لەتوانایدا هەیە لەشکەرێکی وەها بسازێنێت، هیچ کەس و هێزێك نەتوانێت خۆی لەبەر ڕابگرێت و خۆشی بکاتە پادشای هەموو لایەك، بەڵام عیسا لە پادشایەتی دنیا و مادیاتی دنیا دەستی هەڵگرتبوو، دەسەڵات و قودرەتی وی، ڕۆحانی و مەعنەوی بوو. ئەو دەیهەویست لەدڵ و فکری خەڵکیدا پاددشایەتی بکات نەك لەسەر تەختی پادشایەتییەك کە لە ئۆرشەلیمدا بوو.

کاتێك ڕابەرانی یەهوودی_ئەنجومەنی یەهودیان_[88] زانیان ناتوانن عیسای مەسیح بۆ بەرژەوەندییە مادی و ڕامیاری و سیاسیەکانی خۆیان تەیارکەن، لەناچاریدا بوونە دوژمنی و دنیایە گرفتیان هێنایە ڕێ، بەڵام ئەمە بەلای عیساوە گرنگ نەبوو، چوون ئەو گوێی بەفەرمایشتی کردگاری جیهانیان دەدا، نەك قسەیەلە پڕلە بەرژەوەندییە دنیایەکانی ڕابەرانی ئاینی یەهوود.

بەنزیکەی دوای دووساڵ و نیو لە تەعمید(لەئاو هەڵکێشانـ)ـی عیسا، دەمەك کە بەرهەڵستکاری و تەگەرەهێنانە پێش عیسا لەلایەن ڕابەرانی یەهودەوە ڕووی لەزیادی کرد و تەواو ڕێگایان بەرق و دژایەتیکردن تەسك کردەوە لە پێش وی، ڕۆژەك عیسا لەشاگردانی خۆی پرسی:

---

[87]﴿یۆحەنا6/1تا14﴾

[88]یان (سەنهیدرین) لە سەردەمی ژیانی عیسا ئەم ئەنجومەنە هەبوو، بریتیبوو لە71ئەندام، سەرۆکی کاهینەکان یەکێك بوو لەوان و سەرکردایەتی ئەنجومەنەکەی دەکرد، ئەم ئەنجومەنە لە کۆتایدا مەسیحی گرت و دادگای کرد.

"(بەبیرورِای خەڵکی، رِۆڵەی مرۆڤ_کەمنم_ کێیە؟) وەڵامیان دایەوە: بەشێك لەخەڵکی دەڵێن، یەحیای خەڵك لەئاو هەڵکێش، بەشێکی دیکەش دەڵێن ئیلیاسی پەیامهێنەر، بەشێکی تریش بە ئیرمیا یان بەیەکێ لەپەیامهێنەرانت دادەنێن کە لەپێشوودا هەبوون و ئێستا گەرِاویتەتەوە، ئینجا عیسا لێی پرسین: ( ئەی ئێوە دەڵێن من کێم؟)، پەترۆس_کە شەمعونیشی پێ دەوترا_ بەرسڤی دا و وتی: تۆ مەسیحیت، رِۆڵەی خواوەندی زیندوویت، جالەم دەمەدا عیسا پێی فەرموو:
(خۆزگەت پێ دەخوازرێت ئەی شەمعونی کورِی یۆنا، ئەم زانینە لە گۆشت و خوێنەوە نییە، بەڵکو لەو باوکەمەوەیە کەلەئاسمانە، منیش پێت ئەڵێم تۆ پەترۆسی و لەسەر ئەم بەردە کۆمەڵەی خۆم دروست ئەکەم و تەواوی هێزی مردنیش پێ‌ی ناوێرێت.کلیلی پادشاهێتی ئاسمانت پێ دەدەم، ئەوەی دایدەخەیت لەسەر زەوی، داخراو ئەبێت لەئاسمان.) ئینجا قوتابیەکانیشی ئاگادارکردەوە کەجارێ کەس خەوەردار نەکەن ئەو مەسیحە.
ئیتر عیسا لەو کاتەوە دەستی کرد بەرِوونکردنەوە بۆقوتابیەکانی، سەبارەت بەوەی کەدەبێت برِوات بۆ قودس، لەوێ ئازار بدرێت بەدەستی پیران و سەرۆك کاهینەکان و مامۆستایانی شەریعەت، ئەمجا بکوژرێ و لەرِۆژی سێیەمدا زیندوو بێتەوە، پەترۆس عیسای هێنایە ئەم لاوە و سەرزەنشتی کرد و پێی وت: خوانەکات گەورەم، هەرگیز ئەمە نەبینم و بەسەرت نەیەت.
ئینجا عیسا بەپەترۆسی فەرموو: (ئەمە خوخدەی شەیتانە و مەبە بەکۆسپ لەبەردەم مەرگم، ئەم قسانەت دەری ئەخات تۆ هێشتا بیرت لای کاروباری خواوەند نییە و بەڵکو لای کاروباری دنیایە.
دواتر عیسا بە قوتابیەکانی گوت: (ئەوەی دەیەوێت شوێنم بکەوێت با واز لەخۆی بێنێت و خاچی خۆی هەڵبگرێت و دوام کەوێت، چونکە ئەوەی بیەوێت ژیانی ئەو رِزگاربکات، ژیان دەدۆرِێنێت، بەڵام ئەوەی ژیانی خۆی بدۆرِێنێت لەبەر من ئەوا رِزگاری دەکەم، چونکی چی بە کەڵکی مرۆڤ دێت ئەگەر هەموو جیهان بەرێتەوە بەڵام خۆی بدۆرِێنێت؟
یاخود مرۆڤ بۆ کرِینەوەی ژیانی خۆی چی پێشکەش دەکات.
رِۆڵەی مرۆڤ بە شکۆی باوکیەوە لەگەڵ فریشتەکان دەگەرِێتەوە، ئینجا هەرکەسە و بە پێی کرداری خۆی پاداشت وەردەگرێت، رِاستیەکتان پێ دەڵێم، ئەویش ئەوەیە کە: هەندێك لەوانەی لێرەدا رِاوەستاون، مردن نابینن، تا هاتنەوەی رِۆڵەی مرۆڤ نەبینن بە پادشاهێتیەکەیەوە..."[89]
دوای ئەوەی شاگردان تێگەشتن لەوەی کە عیسای مەسیح دەبێت بمرێت، ئەوانیش لەبەر خاتری وی دەبێت قبوڵی هەڵگرتنی هەندێك زەحمەت بکەن، بەبێ دودڵی بۆیان زۆر مایەی گرفت بوو، کە دووبارە بە رِێکی، وەك ئەوەی ئەو زیندوو بێت پەیرِەوی لێ بکەن. بەڵام مامۆستای خۆیان وازلێ نەهێنا، شەش مانگ دوای ئەوە لەگەڵی رِۆشتن بۆ ئۆرشەلیم، ئەو جێگایەی کە عیسای مەسیح دەبوو زەحمەتێکی زۆر قبوڵبکات و گیانی خۆی تێدا بەخت بکات.

---

[89]﴿مەتا13/17تا28﴾

وەرزی بەهار لە فەڵەستین دەستی پێ کرد و زۆرێك لە یەهودییەکان لەو زەمانەدا سەفەریان دەکرد بۆ ئۆرشەلیم و نزیکاییەکانی ئەوێندەر، تا لە گەورەترین جێژنی ئاینی ساڵانەی خۆیان _واتە جێژنی پەسخ_ بەشداری بکەن. ئەم جەژنە ئەوانی دەخستەوە بیری ئەوەی کە چۆن گەلی ئیسرائیل بە سەرکردایەتی موسای پەیامهێن، لە کۆیلایەتی میسر ڕزگاریان بوو.

عیسا و شاگردانیشی تێکەڵ بە زیارەتکاران بوون، بۆ ئەم جێژنە چوونە نێو ئۆرشەلیمەوە، ڕووداوەکانی ئەم ماوەیەی عیسای مەسیح کە کۆتا ماوەکانی بوو لەسەر ڕووی زەوی، لە چوار ئینجیلەکەدا(مەتتا و مەرقۆس و یوحەننا و لۆقا) بە تێروتەسەلی نوسراوە و تۆمارکراوە، لێرەدا کورتەیەك سەبارەت بە چوونی عیسای مەسیح بۆ ئۆرشەلیم و ڕووداوەکانی نێو ئەو سەفەرە و کۆتایەکانی وی بۆ ئێوەی خۆشەویست دەخەمەڕوو :

ڕۆژی یەك شەممە بوو، عیسای مەسیح بەسوار گوێدرێژێکەوە بوو، هەروەك زەکەریای پەیامهێن پێشگۆی کردبوو لە پێشتردا و لە مبارەوە فەرمووبوی:

"ئەی شاری سیۆن(سەهیۆن) زۆر دڵخۆش بە!

ئەی شاری ئۆرشەلیم، هاواری خۆشی بکە!

ئەوەتا پاشاکەت دێتە لات

دادپەروەرە و ڕزگارکەرە

بێ فیزە و سواری ماکەرێك و

جاشی ماکەرێك بووە..."[90]

لە پاشاندا عیسا چووە نێو پەرستگای گەورەی ئۆرشەلیمەوە، بینی ماڵی خودا لە شوێنی پەرستشەوە بۆتە شوێنی بازرگانی، ئەو کەسانەی کە بۆ کڕین و فرۆشتن، ئەو ناوچە پیرۆزەیان پیس و پۆخڵ کردبوو، وە ئەو پەرستشکارانەی کە بۆ ساختە کاری و قۆڵبڕی هاتبوونە ئەوێندەر هەموویانی دوور خستەوە و وەدەری نان، هەتا تواناى تێدابوو چی خۆراکی دانراوی لەناو ئەو ناوچە پیرۆزەدا وەبەردەستیان دەکەوت دەیڕشتن و بڕکی دەدان، کۆترانی لە قەفەزنراوی ئازاد دەکرد، پەز و ئاژەڵگەلی نێو پەچەکانی بەردەدا، ئەوەی توانی کردی بۆ وشیارکردنەوە و دەرخستنی نارەزای زۆری لەو حاڵەی کە نەفامان، پەرستگای گەورەیان تێخستبوو، وە بە توندی پیاوانی ئاینی سەرزەنشتکرد و بە ڕیاکار، دووڕوو، بێ ئیمان و بەدکار لەقەڵەمی دان و مەحکومی کردن، هەر ئەو کاتیش پێش بینی خاپور بوونی پەرستگای گەورەی کرد، وەك تۆڵەیەکی ئیلاهی لێیان، هەروەك نوسراوە لەم بارەیەوە:

"عیسا کاتێك لە پەرستگا هاتە دەرەوە، قوتابیەکانی لێی هاتنە پێشەوە تاکو سەرنجی بۆ تەلارەکانی پەرستگا ڕابکێشن،

---

[90] ﴿زەکەریا 9/9تا11﴾

وەڵامی دایەوە: (( هەموو ئەمانە دەبینن؟ ڕاستیتان پێدەڵێم: لێرە بەردی بەسەر بەردیەوە نامێنێت کە نەڕوخێت))..."[91]
هەروەها خەڵکی وشیار کردەوە لە پەیامهێنەرانی درۆزن_پێغەمبەری درۆزن_ کە دوای خۆی دێن، کۆششی زۆری کرد تا ئەو عالەمە تێبگەیەنێت کە نەکەونە هەڵە و گومڕایی ئەو درۆزنانەوە و فریو نەخۆن لەوەی ئەو کەسانەی بەناوی خوداوە دەڵێن هاتووین و قسە دەکەن، هەروەها فەرمووی کە لە ئاسمانەوە بە هێز و شکۆیەکی زۆرەوە هاتووە بۆ ئەوەی تەواوی میللەتان بەڕێوەبەرێت و دادڤانی بکات، ئەوانەی شایەنن بە پاشایتی ئاسمان بیانگرێتە خۆ و ئەوانەشی کە لە بەدکرداری خۆیان پەژیوان نابنەوە بە سزادانی هەمیشەی ئاگاداریان بکاتەوە.
لە شەوی پێنج شەممەدا، هەر ئەو کاتەی کە بەگشتی مەسیحییەکان بە کاتێکی پیرۆزی حەفتەی دەزانن، عیسای مەسیح مەراسیم و ڕێوڕەسمی تایبەت بە خوانی _جەژنی پەسخ_ لەگەڵ 12قوتابی(شاگرد)ەکەی خۆی ئەنجام دا، عیسا پارچەیەك نانی هەڵگرت و بەرەکەتداری کرد، لە نێوان قوتابیەکاندا دابەشی کرد و فەرمووی:
"وەریگرن، ئەمە جەستەی منە..."[92]
جەسەی منە کە لە پێناو مرۆڤدا پارە پارە دەبێت و ئەم ڕسومە بە یادی من بەجێ بێننەوە دوای خۆم، دوای خواردنی نانەکە جامێك شەراب کە هەمیشە لە لایەن یەهودیەکانەوە بەناونیشانی بەشێك لە نانخواردنی _جەژنی پەسخ_ ئەنۆشرا هەڵیگرت و فەرمووی:
" ئەوەی بە ئێوەم دا لەمەسیحی خاوەن شکۆم وەرگرتووە، ئەوە بوو عیسای خاوەنشکۆ لەو شەوەی تێیدا بەگرتن درا، نانێکی هەڵگرت، سپاسی خواوەندی کرد و لەتی کرد، فەرمووی:
(ئەمە جەستەی منە کە بۆ ئێوەیە. ئەمە بۆیادکردنەوەی من بکەن)
بەهەمان شێوە جامەکەی پاش نانخواردن هەڵگرت و فەرمووی:
(ئەم جامە پەیمانی نوێیە بە خوێنی من، هەرجار دەیخۆنەوە ئەمە بکەن بۆ یاداوەریم)..."[93]
بەم شێوەیە عیسای مەسیح بە قوتابیەکانی فەرموو، لە ڕێگای مەرگیەوە پەیمان _یان عەهد_ێکی نوێ بەرقەرار دەبێت.
پێش ئەوەی کە ژوورەکە بەجێبهێڵن، عیسا گرنگترن فێرکاری خۆی پێیان گوت و فەرمووی: ئەرکە لەسەر شانی گشت لایەکتان کە یەکتریان خۆش بوێت، ئەو سەر لەنوێ بیری قوتابیەکانی هێنایەوە کە دەبێ ئەو نارەحەتیانەش قبوڵبکەن بەهۆی باوەڕداری بە ئەو دێتە ڕێگایان، سەرەڕای ئەمانەش گفتی دا پێیان دوای ڕۆشتنی بۆ ئاسمان، ڕۆحی پیرۆز یاوەریان بکات تا یارمەتیان بدات و بەرچاو ڕۆشنیان پێ ببەخشێت.

---

[91]﴿مەتا24/1تا3﴾
[92]﴿مەرقۆس23/14﴾
[93]﴿یەکەم کۆرنسۆس23/11تا26﴾

کاتێ بویە نیوە شەو، عیسای مەسیح تەك قوتابیەکانی چونە باخێکی نزیك شار، بە مەبەستی دوعاکردن، وە ئامادەکاری بۆ مەرگی خۆی دەکرد و لەم بارەوە نوسراوە کە:

" عیسا وەك جاران چوو بۆ کێوی زەیتوون، قوتابیەکانیش دوای کەوتن، کاتێك گەشتنە شوێنەکە، عیسا پێی فەرموون:

(نوێژ بکەن، تاکو نەکەونە تاقیکردنەوە)

ئینجا نزیکەی بەردەهاوێژێك لێیان دوورکەوتەوە، چۆکی دادا و نوێژی کرد، فەرمووی:

(باوکە ئەگەر دەتەوێت ئەم جامەم لەسەر لاببە، بەڵام نەك بە خواستی من بەڵکو بە خواستی خۆت بێت)

فریشتەیەکیش لە ئاسمانەوە بۆی دەرکەوت کە بەهێزی دەکرد، کە لە ململانێدا بوو، زۆر بە گوڕتر نوێژی دەکرد و ئارەقەکەی وەك دڵۆپی خوێنی لێ هات و دەکەوتە سەرزەوی. ئینجا لە نوێژەکە هەستا و هاتە لای قوتابییەکان، بینی لەخەمان خەویان لێ کەوتووە، پێی فەرموون:

(بۆچی خەوتوون هەستن نوێژبکەن، تاکو نەکەونە تاقیکردنەوەوە)

کاتێك قسەی دەکرد کۆمەڵێك پەیدابوون، ئەوەی پێی دەوترا_یەهوزا_ و یەکێکە لە دوازدە قوتابیەکە پێشیانکەوتووە، لە عیسا نزیك بوەوە تاکو ماچی بکات، عیساش پێی فەرموو:

(ئەی یەهوزا، بە ماچێك کوڕی مرۆڤ بە گرت دەدەیت؟!)

ئەوانەی دەورووپشتیان کاتێك بینیان واخەریکە شتێك ڕوودەدات، گوتیان: گەورەم شمشێر بوەشێنین؟ جا دانەیەکیان لە کۆیلەی سەرۆك کاهینی دا و گوێی ڕاستی بڕیی. عیسا فەرمووی: ڕاوەستن ئەمە بەسە، ئینجا دەستی دا لە گوێی کەسە برینداره‌کە و چاکی کردەوە، پاشان عیسا بە کاهینانی باڵا و فەرماندەی پەرستگا و پیرانی فەرموو:

(وەك ئەوەی بلێیت بۆ گرتنی یاخیبوویەك هاتوون وا کوتەك و شمشێرتان تەك خۆتان هێناوە، ڕۆژانە لە حەوشەکانی پەرستگا لەگەڵتان بووم دەستتان لێ نەدام، بەڵام ئەمە کاتی ئێوەیە، کاتی دەسەڵاتی تاریکییە)..."[94]

دواتر عیسایان بردە شوێنێك کە هەندێ لە پیاوانی ئاینی یەهود لەوێندەر جەم بوبوون تا بەهانەیەك بۆ کوشتنی عیسا بدۆزنەوە بەڵام هەرچەند کۆشان، نەیان توانی و لەکۆتایدا سەرۆکی جەمبوانی ئەوێندەر، عیسای سوێنددا و لێی پرسی: ئایا تۆ مەسیحی کوڕی خودای؟... لەبارەی ئەم ڕووداوانەوە بەتێروتەسەلی لە کتێبی پیرۆزدا نوسراوە کە:

"کاهینانی باڵا هەموو بە دوای شایەتییەك دەگەڕان، لەسەر عیسا تاوەکو بیکوژن، بەڵام دەستیان نەکەوت، کەسانێکی زۆر بە درۆوە شایەتیان لەسەری دا، بەڵام شایەتییەکانیان کۆك نەبوو، هەندێك هەستان و بەدرۆوە شایەتیان لەسەری دا و گووتیان: گوێمان لێبوو دەیگووت: ئەم پەرستگایەی دەستکردە، دەیڕوخێنم و بەسێ ڕۆژ یەکێکی کە بنیات دەنێم، کە دەستکرد نەبێت، لەمەشدا دووبارە شایەتییە درۆکان کۆك نەبوو.

---

[94] ﴿لۆقا22/39تا54﴾

**سەرۆك كاهینیش لە ناوەڕاست ڕاوەستا و لەعیسای پرسی: هیچ وەڵام نادەیتەوە؟ ئەوانە شایەتی چی لە دژت دەدەن؟ بەڵام عیسا بێدەنگ مایەوە و هیچ وەڵامی نەدایەوە، دیسان سەرۆك كاهین لێی پرسیی و پێی گووت: ئایا تۆ مەسیحی كوڕی خواوەندیت؟**

**عیسا فەرمووی:**

**(من ئەوم. لە داهاتوشدا دەبینن كوڕی مرۆڤ لە دەستە ڕاستی توانادار و باڵەست دادەنیشێت و لەگەڵ هەوری ئاسماندا دێتەوە)**

**سەرۆك كاهین جلكەكانی خۆی دادڕی و وتی: ئیتر چ پێویستمان بەشایەت هەیە؟! خۆ گوێتان لە كفرەكەی بوو؟ ڕاتان چییە؟**

**هەموو بڕیاریاندا كە شایەنی مردنە، هەندێك كەوتنە تف لێكردنی، دواتر دەموچاویان داپۆشی و لێیان دەدا، پێیان دەگوت : ئەگەر تۆ كوڕی خواوەندیت بزانە كێ بوو لێیدایت؟ گاڵتەیان پێ دەكرد و بەشەق و زللە تێی بەربوون..."[95]**

**لەبەر ئەوەی دەسەڵات داران و حاكمانی یەهود نەیاندەتوانی كەسێك بەبێ مۆڵەتی دەوڵەتی ڕۆم لەداربدەن یان بكوژن، بەیانیەكی ڕۆژی هەینی زوو، عیسایان بردە كۆشكی (پیلاتۆس)[96]ی حاكمی ڕۆم، و وتیان بە پیلاتۆس كە عیسا لەدوژمنانی دەوڵەتی ڕۆمە، دەیەوێت خۆی ببێتە پاشا، كاتێك پیلاتۆس لێ پێچینەوەی لەسەر ئەم بابەتە تەك عیسادا كرد، خێرا تێگەیی ئەم تۆمەتانە تەواو درۆیە لەبەر ئەم تێگەشتنەشی ویستی عیسای مەسیح ئازاد بكات، بەڵام پیاوانی ئاینی و داوەرانی یەهودی خێرا جەم بوون بۆ ئەوەی تەكبیر بكەن فەرمانی لە داردانی عیسا جێبەجێبكرێت، پیلاتۆسیش كە دەترسا ئاشوبێك هەڵگیرسێت، لە گوێی پیاوانی یەهودی كرد و بڕیاری دا عیسا بە هیلاكدا بەرن و لە خاچی بدەن.**

**دەم و دەست عیسا لەلایەن سەربازانی ڕۆمەوە، برایە دەرەوەی شاری ئۆرشەلیم و ئەویان لە دەرەوە لە خاچ دا، كاتێك جەلادان هێزیان لە لاشەیدا نەهێشبوو بەلێدان، لەسەر خاچەكە نیوە مردوو ڕایانخستبوو، وە خەریكی بزمار داكوتین بوون بەلاشەیدا، عیسا بۆئەوانەی كە وایان بەسەر هێنا بوو نزای دەكرد و دەیگوت:**

**"خودایە لێیان خۆش بە، لە جەللادەكانم خۆش بە، ئەوانە نازانن خەریكن چی دەكەن..."[97]**

**چ خۆشەویستیەكی لە ڕادەبەردەر و بێوێنەیە كە كەسێك لە خواوەند داوای لێخۆش بوون بۆ كەسانێك بكات كە سەرقاڵی مێخ داكوتانن بە دەست و پێكانیدا و بەڕاسەریەوە قەساوی دەكەن!**

**خۆ عیسا باش دەیتوانی لە باوكی ئاسمانی خۆی داوابكات كە ئەو لە ڕەنج كێشانی سەر خاچەكە ڕزگاربكات و بڕوات**

---

[95]﴿مەرقۆس**55/14**تا**66**﴾

[96]فەرمانەڕەوایەكی ڕۆمی بوو، لەسەر یەهودیا و سامیرە و سەدوم، لە ساڵانی26-36ی زاینی، بە دڵڕەقی و توندی ناوبانگی دەركردبوو بەتایبەت بەرامبەر بە جولەكەكان.

[97]﴿لۆقا**34/23**﴾

بۆ ئاسمان، بەڵام هەرگیز داوایەکی لەم شێوەیەی نەکرد، ئەو بەباشی دەیزانی کە ئیرادە و ویستی خواوەند ئەمە بووە کە ئەو بەم شێوەیە ڕەنج بکێشێت و وەك قوربانییەك لە پێناو گوناهکاران گیانی خۆی ببەخشێت، هەر لەبەر ئەم زانینەش بوو، فەرمانبەرداری و گوێداری باوکی ئاسمانی خۆی کرد و ماوەی شەش کاتژمێر بە عەزابێکی زۆرەوە لەسەر خاچەکە مایەوە، دواتر لە کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆدا بەم شێوەیە بەدەم ئازارەوە هاتە گۆ:

"باوکە، ڕۆحی خۆم بەدەستی تۆ دەسپێرم...ئەمەی فەرموو، گیانی سپارد"[98] ئەوکات سەربازێك هات و ڕمێکی لە کەلەکەی عیسا دا و بینی کە مردووە، دواتر خەبەریان دا بە پیلاتۆس و ئەرخەیانیان کرد لەوەی کە عیسا مردووە، دوای ئەوە دوو نەفەر لەوانەی کە باوەڕیان بە عیسا هەبوو، وە ناڕەزابوون لە بڕیاری لە خاچ دانەکەی، وێرایان و چوونە لای (پیلاتۆس) و لاشەی عیسایان داواکرد ئەویش پێی دان، لاشەکەیان لە خاچەکە کردەوە و عیسایان بە بۆنی خۆش و موڕ[99] و کەتان جەم وجورکرد و پێچایانەوە، وە لە گۆڕێکدا کە لە شێوەی ئەشکەوتێکی بچووکی بەردین بوو، لە بنار گردۆڵکەیەك دایان نا، دواتر بەردێکی گەورەیان بە دەرکەکەیەوە نا، پیلاتۆس لەژێر کاریگەری مقۆمقۆ و داوایەکی تری کاهینانی یەهودیدا بڕیاری دا کە دەرگای ئەشکەوتەکە بە باشی بگیرێت و چەند سەربازێکیش پاسەوانی گۆڕەکە بکەن، تا کەس نەتوانێت بڕواتە ژورەوە و تەرمەکە بدزێت و دوای بڵێن عیسا زیندوو بۆتەوە و ڕۆشتووە و ئاشوبێکی گەورەتر لە ئاشوبی پێشوو هەڵگیرسێنن.

عیسا پێشتر چەند جارێك بە قوتابیەکانی گوتبوو کە لە خاچ دەدرێت و ڕۆژی سێیەم(سێ ڕۆژ دوای مردنەکەی) هەڵدەستێتەوە و دێتەوە، ئەوان هەروا تێگەشتبوون کە عیسا نموونەیان بۆ دێنێتەوە، کاتێ کە مرد و کفن و دفن کرا بێ ئومێد بوون لەوەی کە جارێکی تر ئەو سەرلەنوێ لەسەر ڕووی زەوی ببینین، بەڵام بەیانی ڕۆژی یەك شەممە، کاتێك هەندێك لە شوێنکەوتوانی ڕۆشتنە ئەو شوێنەی عیسای لێ دانرابوو، بینیان دەرکی قەبرەکە کراوەیە و کاتێك چوونە نێو قەبرەکەوە دیتیان ئەو کەتان و پەڕۆیەی عیسای پێ پێچراوە خاڵییە، لاشەی عیسای تێدا نەماوە، دوای ئەو دیار نەمانەی عیسا، هەروەك خۆی گوتبووی پێشتر، گەڕایەوە و چەندین جار خۆی بە زۆرێك لە بڕواداران نیشان دابوو، قسەی تەکدا کردبوون وە ئەوانیش ناسیبوویانەوە، ئەو شەوەی کەهەواڵی دیارنەمانی عیسای مەسیح بڵاوبوویەوە دوای مردنی، هەندێ لە باوەڕداران و قوتابیانی عیسا لەژوورێك جەم بوو بوون و لە کاتێکدا کە دەرکە و پەنجەرەی ئەو ژوورە هەموو داخرابوو، عیسا لە ناوەڕاستی ژوورەکە دەرکەوت و لەگەڵیان قسەی کرد، ئەوانی دڵنیاکردەوە کە زیندووە، دوای چل ڕۆژ عیسا چەندین جار لە جێگای جیاواز، دەرکەوت بۆ قوتابیانی خۆی و بۆیانی ڕوونکردەوە کە بۆچی دەبوو ئەم ئازار و ئەشکەنجەیە قبوڵبکات و گیان بسپێرێت، هەروەها فەرمانیشی دا کە قوتابیانی بە سەرتاسەری جیهاندا بڕۆن و مزگێنی

---

[98] ﴿لۆقا 23/46﴾

[99] موڕ: ئاوێکی بۆن خۆشە لە گەڵای جۆرە گوڵێك دەردەچێت، هەندێ جار لەگەڵ مەی تێکەڵاو دەکرا بۆ کەمکردنەوەی ئازار.

بەرهەقی وی بەگشت لایەك بگەیەنن، وە بە هەموو خەڵك بڵێن: ئەگەر عیسا وەك ڕزگاریكار و خواوەندی خۆیان قبوڵبكەن ئەوا گوناهەكانی ئەوان دەبەخشرێت، هەروەها ئەوكات وتی پێیان كە چەند ڕۆژێك لە ئۆرشەلیم بمێننەوە تا(روح القدس/ ڕۆحی پیرۆز) دێتە لایان و یاوەریان دەكات.

لە كۆتایشدا دوای ئەوەی گفتی پێدان كە خۆشی تا كۆتایی جیهان ڕۆحییەن یاوەر و ئاگاداریان دەبێت، لەم كاتەدا بەرەو ئاسمان بەرزكرایەوە و هەموو قوتابیان سەیریان دەكرد، لەبارەی ئەم بەسەرهاتانەوە لە كتێبی پیرۆزدا و لە هەر چوار ئینجیلی مەتا و مەرقۆس و لۆقا و یۆحەنادا بە ڕونی و وردی نوسراوە كە:

"دوای لە خاچ دان و گیان سپاردنی عیسا دەمەو ئێوارە پیاوێكی دەوڵەمەندی خەڵكی ڕامە هات، ناوی یوسف بوو، ئەویش یەكێك بوو لەو باوەڕدارانەی كە چاوەڕێی پادشایەتی ئاسمان بوو، وێرای و چوو بۆلای پیلاتۆس، داوای تەرمەكەی عیسای كرد، پیلاتۆس سەرسام بوو ئاوای بەزووی عیسا مردووە، سەرپەلەكەی بانگ كرد و لێی پرسی ئاخۆ دەمێكە مردووە. كاتێك پیلاتۆس لە سەرپەلەكەوە زانی مردووە، تەرمەكەی دایە یوسف، ئەویش كەتانی كڕی، دایی گرت و بەكەتان كفنی كرد، لە گۆڕێكدا ناشتی كە لە بەرد هەڵكۆڵرابوو، ئینجا بەردێكی گلۆر كردەوە سەر دەرگای گۆڕەكە، مریەمی مەجدەلی و مریەمی دایكی یەعقوب بینیان لە كوێ نێژرا. كە شەممە بەسەرچوو، مریەمی مەجدەلی و سالومە و مریەمی دایكی یەعقوب، بۆن و بەرامەیان كڕی تاكو بچن تەرمی عیسا چەور بكەن، لە یەكەم ڕۆژی هەفتەدا، بەیانی زوو لەگەڵ خۆرهەڵهاتن، هاتنە سەرگۆڕەكە. بە یەكتریان دەگووت: باشە كێ بەردی سەر دەرگای گۆڕەكەی بۆ گلۆر دەكاتەوە؟ بەڵام كە سەیریان كرد، بینیان بەردەكە گلۆر كراوەتەوە، هەرچەندە زۆریش گەورەبوو بەردەكە و كێشێكی زۆری هەبوو. چونە ناو گۆڕەكە و گەنجێكیان بینی لای ڕاست دانیشتبوو، كەوایەكی سپی لەبەر بوو، ئەوانیش حەپەسان. گەنجە نورانیەكە پێی گوتن: مەحەپەسێن، بە شوێن عیسای ناسیرەی لە خاچ دراو دەگەڕێن. ئەو هەستایەوە! لێرە نییە. ئەوەتا لەو شوێنەی لێیان دانا. بەڵام بڕۆن بەقوتابییەكان و بە پەترۆس بڵێن، ئەو پێشتان دەكەوێت بۆ جەلیل، وەك پێی فەرموون لەوێ دەیبینن، ژنەكان لە گۆڕەكە هاتنە دەرەوە و بەخێرایی گۆڕستانەكەیان بەجێهێشت، لەرز و سەرسامی دایگرتبوون، هیچیان بە كەس نەگووت چونكە دەترسان، دوای ئەوە بەیانی زوو لە یەكەمی هەفتە عیسا هەستایەوە، یەكەم جار بۆ مریەمی مەجدەلی دەركەوت، ئەو ژنەی حەوت ڕۆحی پیسی لێ دەركردبوو، ئەویش چوو بەوانەی گووت كە لەگەڵ ئەودا بوون، شیوەنیان دەگێڕا و دەگریان، كاتێك بیستیان عیسا زیندووە و ئەم بینیویەتی، باوەڕیان نەكرد.

دوای ئەمانە عیسا بە شێوەیەكی دیكە بۆ دووان لەوان دەركەوت، كاتێك بۆ گوندەكان بەڕێوە بوون، جاچوون بەوانی دیكەیان ڕاگەیاند، بەڵام باوەڕیان پێنەكردن. پاشان عیسا بۆ یانزەكە دەركەوت، كاتێك لەسەر خوان بوو لەبەر بێباوەڕی و كەلـلەڕەقییان سەرزەنشتی كردن، چونكە باوەڕیان بەوانە نەكرد كە دوای هەستانەوەكەی بینیوویان. پێی فەرموون:

**برۆن بۆ هەموو جیهان و ئەم مزگێنییە بەهەموو باوەڕداران ڕابگەیەنن، ئەوەی باوەڕدەهێنێت و لەئاو هەڵدەکێشرێت ڕزگاری دەبێت، ئەوەش کە باوەڕناهێنێت، تاوانبار دەکرێت. ئەوانەی باوەڕدەهێنن ئەم نیشانانەیان لەگەڵ دەبێت، بە ناوی من ڕۆحی پیس دەردەکەن و بە زمانی نوێ دەدوێن، بە دەستیان ماردەگرن، ئەگەر ژەهری کوشندەش بخۆنەوە زیانیان پێناگات، دەست لەسەر نەخۆش دادەنێن و چاکدەبنەوە.**

**لەدوای ئەوە عیسای خاوەن شکۆ، ئەمانەی فەموو پێیان، بۆ ئاسمان بەرزکرایەوە و لە دەستە ڕاستی خودا دانیشت، ئەوانیش چوون و لە هەموو لایەك جاڕیان دا، عیسای خاوەنشکۆش لەگەڵیان کاری دەکرد و بە پەرجووەکانی پشتگیری پەیامەکەی دەکرد."[100]**

**عیسای مەسیح پێش بەرزکردنەوەی بۆ ئاسمان، هەرگیز وەك جێنشین کەسی دیاری نەکرد، هەرگیزیش پێشگۆی هاتنی هیچ پەیامهێنەرێك(پێغەمبەرێک)ـی تری لەدوای خۆی نەکرد، قوتابیان و شاگردانی کاتێك مامۆستای خۆشەویستی خۆیانیان، لەپێش چاو ون بوو، دەستیان نەکرە شیوەن و گریان، چوون باش دڵنیابوونەوە لەوەی عیسا هەمیشە ڕۆحییەن لە تەکیاندایە و هەروەك خۆشی کە گفتی داوە ڕۆژێك دێت دەگەڕێتەوە بۆ ئەم جیهانە.**

**شوێنکەوتوان و قوتابیانی ئەمجار بەشادییەکی زۆرەوە کاتەکانی خۆیان بە نزاکردن دەبردە سەر، چاوەڕێی دەرکەوتنی ڕۆحی پیرۆز بوون کە عیسا پێی فەرمووبوون بە زوویی دێتە لایان. دە ڕۆژ گیان سپاردنی عیسا، لەکاتی جەژنی(پنتیکاست)[101]ی یەهودییەکان، نزیکی سەد و بیست نەفەر لە باوەڕداران و قوتابیانی عیسا لە دەوری یەك کۆبووبونەوە، بویەر و پێشهاتێکی تەواو سەیروسەمەرە ڕووی دا، هەموو دەنگێکیان بیست لە شێوەی دەنگی ڕەشەبادا بوو، بەڵام ڕاستیەکەی دەنگی ڕەشەباش نەبوو، ئینجا چەند زمانێکی دابەشبوو وەك ئاگر بۆیان دەرکەوت و لەسەر هەریەکەیان دابەزی و نیشتەوە، بەڵام ئاگریش نەبوو، جاهەموویان پڕبوون لە ڕۆحی پیرۆز دەستیان کرد بەقسەکردن بە زمانەکانی تر، وەك ڕۆحی پیرۆز پێی بەخشین**

**کاتێك کە کۆمەڵێکی زۆر لە مرۆڤانی سەرزەمینگەلی تر لە دەور قوتابیان و فێرکاران کۆبوونەوە هەرکەسێك پەیامی خۆی بەزمانی دایکی خۆی گوێ لێ دەبوو وە هەموان سەریان لەم حاڵە سوڕما.[102]**

---

[100]﴿مەرقۆس**42/15**تا**47**﴾ وە ﴿مەرقۆس**1/16**تا**19**﴾ هەروەها ئەم بەسەرهاتە لە سێ ئینجیلەکەی تریشدا بەشێوە و وێنەی تر باس کراوە بۆ نمونە لە: ﴿مەتا**1/27**تا**65**﴾ و ﴿مەتا**1/28**تا**20**﴾ و ﴿لۆقا**32/23**تا**56**﴾ و ﴿لۆقا**1/24**تا**53**﴾ و ﴿یۆحەنا**1/19**تا**42**﴾ و ﴿یۆحەنا**1/20**تا**31**﴾

[101]پنتیکاست یان پەنجایەمین: پەنجاهەمین ڕۆژدوای جەژنی پەسخە، هەروەها ڕۆژی جەژنی دروێنەیە، بڕوانە کتێبی پیرۆز-پەیمانی کۆن: ﴿دەرچوون**16/23**﴾ و ﴿دەرچوون**22/34**﴾.

[102]( کە ڕۆژی پەینجایەمین داهات، هەموو پێکەوە لە یەك شوێن بوون، لەناکاو دەنگێك لە ئاسمانەوە وەك ڕەشەبا هات، ئەو ماڵەی پڕکرد کە تێیدا دانیشتبوون. ئینجا چەند زمانێکی دابەشبوو وەك ئاگر بۆیان دەرکەوت و لەسەر هەریەکەیان نیشتەوە. جا هەموویان پڕبوون لەڕۆحی پیرۆز و دەستیان پێکرد بەزمانەکانی دیکە بدوێن، وەك ڕۆح پێی بەخشین. لەو کاتەدا جولەکەی لەخواترسی هەموو نەتەوەکانی ژێر ئاسمان لە ئۆرشەلیم مابوونەوە، کاتێك دەنگەکە هات، خەڵك کۆبوونەوە و بووە پشێوی، چونکە هەریەکەیان گوێی لەزمانی خۆی دەبوو پێی دەدوان، حەپەسابوون و بەسەرسامییەوە گوتیان: باشە هەموو ئەوانەی قسە دەکەن جەلیلی نین؟ ئەی

**ئەوکات پەترۆس ئاخێزیا و ڕووی قسەی کردە کۆمەڵەکە و وتی کە عیسای مەسیح گفتی خۆی بەجێ گەیاندووە لە بارەی ناردنی ڕۆحی پیرۆزەوە دوای مرنی خۆی و ڕاکێشانی بۆ ئاسمان، پەترۆس بە یارمەتی ڕۆحی پیرۆز ڕوونی کرەوە بۆ ئەو کەسانەی کە لەوێندەر جەم بووبون و پێی گوتن کە بۆچی پێویست بوو عیسا لەبەر خاتری گوناهەکانی مرۆڤ گیان بسپێرێت و خواوەند بەچ شێوەیەکیش ئەوی لەناو مردواندا هەستاندۆتەوە.**

**هەروەها وتی کە خۆی و تەواوی (رسولان/نێردراوان) شایەتن، چلۆن عیسا زیندوو بویەوە لەناو مردووان و گەڕایەوە لایان، هەروەها خەڵکی ڕێنوێنی دەکرد بۆ ئەوەی تۆبە بکەن و بەعیسای مەسیح باوەڕ بێنن تا گوناهەکانیان ببەخشرێت.**

**ڕۆحی پیرۆز گوتاری پیرۆزی ئاینی پەترۆسی بە شێوەیەك ڕەوان و دڵگیر کردبوو، کە دڵی خەڵکی بە جارێك بەلای خۆیدا ڕاکێشا و هەر لەو ڕۆژەدا سێ هەزار کەس لە یەهودییان باوەڕیان هێنا و بە ناونیشانی پاك بوونەوە لە گوناهەکانیان بە ناوی عیسای مەسیحەوە لەئاو هەڵکێشران_تەعمید کران_.**

**لە دوای ئەمەوە نێردراوان_رسولان_ و شاگردانی عیسای مەسیح بە گەیاندن و بڵاوکردنەوەی مزگێنی ڕزگاری لە شاری ئۆرشەلیم و تەواوی نیشینگەکانی دەوری ئەوێ درێژەیان دا و بەردەوام بوون و زۆرێك لە خەڵکی لەسەر دەستیان باوەڕیان هێنا.**

**دواتر دەسەڵاتدارانی یەهود، بەو شێوەیەی کە عیسا پێشگۆی بۆ کردبوو، کەوتنە ئازار و ئەشکەنجەدانی باوەڕداران و تا گەشتە ئەوەی هەندێکیشیان لێ کوشتن، لە ئەنجامدا زۆرێك لە پەیڕەوکارانی عیسای مەسیح لە فەڵەستین هەڵهاتن، سەرەڕای ئەمەش کە هەڵهاتبوون، دەگەیشتن بە هەر ئاوەدانییەك کە خەڵکی تێدا ئاکنجی بوبێت، مزگێنی عیسایان دەگەیاند و لە ئەنجامدا لە زۆر لاوە یەهودیگەلێکی فرە باوەڕیان بە عیسای مەسیح هێنا.**

**دواتر خودا پەترۆسی ڕێنمایی کرد بۆ ئەوەی بڕواتە ماڵی ئەفسەرێك کە یەهودی نەبوو، وە پەیامی ڕزگاری بە خۆی و خانەوادەکەی بگەیەنێت، تەواوی تاکەکانی ئەم خێزانە باوەڕیان هێنا و لەئاو هەڵکێشران و ڕۆحی پیرۆزیان دەست خۆیان خست و دۆزیانەوە.**

**بەم شێوەیە ڕوون بویەوە کە خودا ویستی وایە هەموو جۆرێکی مرۆڤ لەهەر قیلە و زمانێك هەیە_واتە هەم یەهودییەکان و هەم غەیرە یەهودیەکانیش_ ڕزگاری بەدەست بهێنن.**

---

چۆن هەریەکەمان گوێی لە زمانی دایکی خۆی دەبێت؟ ئێمەی خەڵکی پەرتیا و میدیا و ئیلامی، دانیشتوانی میسۆپۆتامیا، یەهودیا و کەپەدۆکیا، پۆنتۆس و ئاسیا، فریجیا و پامفیلیا، میسر و ناوچەکانی لیبیای ڕووە و کورێن_گەورەترین شار لەوڵاتی لیبیا لەم سەردەمەدا_ هەروەها میوانەکانی ڕۆما، جولەکە و بەجولەکە بوو، کریتی و عەرەب، ئەوەتا گوێمان لێیانە بەزمانی خۆمان باسی کردارە مەزنەکانی خودا دەکەن، هەموو سەرسام و حەپەساو بوون، بە یەکتریان دەگووت: دەبێ ئەمە واتای چیبێت؟! هەندێکی دیکە بە گاڵتە پێکردنەوە دەیان گوت: شەرابی نوێیان زۆر خواردۆتەوە، پەترۆس لەگەڵ یانزە نێردراوەکەی عیسا ڕاوەستا و دەنگی بەرزکردەوە و پێی ڕاگەیاندن: ئەی پیاوانی جولەکە و هەموو ئەوانەی لە ئۆرشەلیم دانیشتوون، گوێ لە قسەکانم بگرن، چونکە وەك بیردەکەنەوە ئەمانە سەرخۆش نین، بەڵکو وەك خودا فەرموویەتی: لە ڕۆژی کۆتایدا ڕۆحم بەسەر هەموو خەڵکیدا دەڕێژم..) ﴿کردار**2**/**1**تا**18**﴾

**یەکێك لە پێشەواکانی یەهود کە ناوی (شاول_دواتر ناوی گۆڕا بۆ پۆڵس_)بوو، لە دژایەتیکارە سەرسەختەکانی پەیڕوانی عیسای مەسیح بوو، هەمیشە سەرقاڵی راوەدوونان و گرتن و کوشتن و بڕینی باوەڕداران بوو، کاتێ کە ڕەوانە کرا بۆ(شام/دیمەشق) تا ئیمانداران لەوێ دەستگیر بکات، عیسای مەسیح ڕاستەخۆ لە ڕێگاکەیدا خۆی پێ نیشاندا لە ئاسمانەوە و پێی فەرموو: "بۆچی دەمچەوسێنیتەوە؟!" پۆڵس کاتێ عیسای مەسیحی بەو شێوە زیندوو و ڕاستەوخۆیە بینی، باوەڕی هێنا و مەسیحیش لەوە بەدوا ئەوی وەك نێردراوێکی خۆی دیاری کرد، دواتر ناوی وی لە شاولەوە گۆڕیا بۆ پۆڵس و بەو ناوەوە ناسرا.**[103]

**بۆگەیاندنی مزگێنی ڕزگاری عیسای مەسیح زۆر شوێن گەڕا (یۆنان و ڕۆم)یش بۆ ئەو دوو سەختزین جێگا بوون، کە تێیدا ئاسیوێکی زۆری خوارد، سەرەڕای ئەمەش پۆڵس 13نامەی لە نامەکانی پەیمانی نوێ نوسی.**

**مرۆڤ کاتێك لە پەیمانی نوێدا پێشڕەفت و گەشەکردنی مەسیحیەت، دوای لەخاچدان و هەستانەوەی عیسای مەسیح دەخوێنێتەوە و دەبینێت، بە باشی تێدەگات لەوەی دوای ڕۆشتنی عیسای مەسیح بۆ ئاسمان پەیامی وی لە کەمی نەدا و نەپوکایەوە، ئەوەی پەترۆس و پۆڵس و باقی ئیمانداران ئەنجامیان دا لە ڕاستیدا کارێك بوو کە مەسیح لە نێو خەڵکیدا ئەنجامی دەدا، مادامەکی مەسیحیش لەناو مردووان هەستایەوە و زیندووە، ئیتر پێویست نەبوو بۆخۆی جێنشین دیاری بکات، لەبەرئەوەی ئەو هەمیشە لەنێو پەیڕەوانیدا بوونی هەیە و ئامادەیە.**

**چەند کارێکی باشە کە مرۆڤ ڕزگاریکارێکی میهرەبان و بەهێزی هەبێت کە هەمیشە زیندوو بێت و ئامادەگی هەبێت، یاوەری هەرکەسێك بکات کە باوەڕ و متمانەی بە یارمەتی ئەو هەیە.**

---

[103] (شاول_پۆڵس_ هێشتا هەڕەشەی لە قوتابیەکانی عیسای خاوەنشکۆ دەکرد و هەوڵی کوشتنی دەدان، چوون بۆ لای سەرۆکی کاهینان، داوای نامەی لێ کرد بۆ کەنیشتەکانی دیمەشق، تاکوو ئەگەر یەکێك ببینێت و سەر بە ڕێگاکە بێت_ڕێگای پادشاهێتی عیسا_ چ ژن بێت چ پیاو بەبەندکراوی بۆ ئۆرشەلیمیان ببات، کە ڕۆشت و لە یمەشق نزیك بوەوە، لەپڕ ڕوناکییەك لە ئاسمانەوە لە دەوروبەری کەوتە سەر زەوی و گوێی لە دەنگێك بوو پێی فەرموو: شاول! شاول! بۆچی دەمچەوسێنیتەوە؟ شاول پرسیاری کرد: تۆکێیت؟ فەرمووی من عیسام، ئەوە تۆ دەیچەوسێنیتەوە، هەستە و بڕۆ، بڕۆ ناو شار، لەوێ پێت دەگوترێت دەبێت چی بکەیت، ئەوانەی کە لەگەڵی بوون بە بێدەنگی و حەپەساوی وەستابوون، دەنگەکەیان دەبیست بەڵام کەسیان نەدەبینی، شاول لەسەر زەوییەکە هەستایەوە چاوی کرابوەوە، بەڵام هیچی نەدەبینی و کوێر بوو بوو، دەستیان گرت و هێنایانە ناو دیمەشق، سێ ڕۆژان هیچی نەدەبینی هیچی نەخوارد و هیچی نەخواردەوە، لە دیمەشق قوتابییەك هەبوو، ناوی (حەنانیا)بوو، مەسیحی خاوەنشکۆ لە خەویدا پێی فەرموو: حەنانیا! ئەویش گوتی: بەڵێ گەورەم! ، مەسیح پێی فەرموو: هەستە و بڕۆ ئەو شەقامەی پێی دەگوترێت ڕاست، لە ماڵی یەهوزا پرسیار لە پیاوێکی تەرسۆسی بکە ناوی شاولە، وانوێژ دەکات. پۆڵسیش لە خەونیدا پیاوێکی بینیبوو بەناوی حەنانیا، کەدێتە لای و دەستی لەسەر دادەنێت، تاکو بینای بۆ بگەڕێنێتەوە، حەنانیا لە خەوەکەدا وەڵامی دابوویەوە: گەورەم لە زۆر کەس ئەو خراپانەم بیستووە کەئەم پیاوە لە ئۆرشەلیم بە گەلە پیرۆزەکەی تۆی کردووە، ئەوەتا لێرە لە کاهینانی باڵاوە دەسەڵاتی هەیە، هەموو ئەوانە بگرێت کە بە ناوی تۆوە دەپاڕێنەوە، بەڵام مەسیح پێی فەرموو: بڕۆ! ئەم پیاوە بۆ من کەسێکی هەڵبژێردراوە، بۆ هەڵگرتنی ناوی من لە بەردەم نەتەوەکان و پادشایان و نەوەی ئیسرائیل، پیشانی دەدەم کە لەبەر ناوی منیش دەبێ چەندە ئازار بکێشێت. حەنانیاش ڕۆشت و چووە ماڵەکە، دەستی لەسەر پۆڵس دانا و وتی: برام شاول، عیسای خاوەنشکۆ منی ناردووە، ئەوەی کاتێك هاتیتە ئێرە لە ڕێگادا بۆت دەرکەوت، تاکو دیسان ببینیت و پڕ بیت لە ڕۆحی پیرۆز، دەست بەجێ شتێکی وەك توێکڵ لە چاوەکانی کەوتە خوارەوە، ئینجا ڕووناکی گەڕایەوە بۆ چاوەکانی، تۆبەی کرد و لەئاو هەڵکێشرا. نانی خوارد و هێزی وەبەر هاتەوە، بۆ چەند ڕۆژێك لە دیمەشق لەگەڵ قوتابییەکان بوو.)﴿کردار**9**/**1**تا**19**﴾

بڵاوبونەوە و پێشکەوتنی سەرسوڕهێنی مەسیحییەت، لـە 100 ساڵی سەرەتا دوای مەرگی عیسای مەسیح، نە بەهۆی جەنگ و خوێن ڕێژییەوە بوو، نە بەهۆی دەسەڵاتی سیاسی و نە بەهۆی دەوڵـەمەندی شوێنکەوتوانی مەسیحەوە بوو، لـە هەموو بەشـەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم و و زۆرێك لـە سەرزەمینەکانی تر بە یەهودی و بتپەرست و..هتد، باوەڕیان بە عیسای مەسیح هێنا، لـەم ڕێگەیەوە بوونە ڕۆڵەی خودا، ئەم کارە لـە ڕێگای جاڕدانی مزگێنی خۆشەویستی خودا بۆ مەسیح و بەهۆی کارایی و بەهێزی ڕۆحی پیرۆز لـە بیر و دڵی بیسەراندا بە ئەنجام گەشت

(بەشی حەوتەم)

# عیسای مەسیح کێیە؟

**هاورێی هێژام**

**کتێبگەلی کلّفت و زۆر بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە گرنگە نوسراون، هەرچەندە سەختە مرۆڤ بتوانێت بە شێوەیەکی کورت و پوخت شیبکاتەوە کە عیسای مەسیح کێیە، بەڵام هەوڵی خۆم دەدەم ئەم کارە ئەنجام بدەم. تاکە ژێدەر کە تەواو باوەڕپێکراو ناسراوە لەم بارەوە کتێبی پیرۆزە، هەموو ئەو خاڵانەش کە دەمەوێت لێرە ئاماژەی پێ بدەم، پشت ئەستورە بە نوسراوەکانی نێو کتێبی پیرۆز.**

**لەبەر ڕۆشنای چوار ئینجیلەکەدا، ژیانی عیسای مەسیح ڕوون دەبێتەوە کە بەڕاستی مرۆڤ بووە، ئەگەر چی باوکێکی جەستەی و ئاسایی نەبوو، بەڵام لە ڕێگای دایکییەوە(مریەم)، لەبنەچەی (داود) کە پەیامێنەر و پاشای ئیسرائیل بوو، عیسا وەك هەموو خەڵکی لە لایەنی جەستەیی و ڕۆحییەوە گەورە بوو، خواردنی دەخوارد و دەخەوت، ئیشی دارتاشی بوو، ماندوو دەبوو، بە تەواوی خۆشییەکان و ڕەنج و نارەحەتییەکان کە بۆ خەڵکی لەم جیهانەدا دێتە پێش تەواو ئاشنابوو.**

**هەر لەبەر ئەمە ئەو باڵادەستە، لەهەموو ئەو ئەزموونانەی کە دێتە ڕێگای ئێمە و وە تەك ئێمەدا هاودەردی دەکات[104] عیسا مرۆڤ بووە دەیتوانی هاوسەرگیری بکات و منداڵ بخاتەوە بەڵام ئەم کارەی نەکرد، بێگومان بڕیاری ئەو لەم بارەیەوە پەیوەستی و گوێ لەمستی ئەوە بۆ ئەو نەخشانەی کە خواوەند لە ئاسمان بۆی دارشتووە.**

**هەرچەندە عیسا بەڕاستی مرۆڤ بوو، بەڵام لە زۆر ڕووەوە لەگەڵ مرۆڤی تردا جیاوازی فرەی هەبوو، هەرروەك لە پێشتردا باسم کرد و ڕوونم کردەوە، هەموو خەڵکی، تەنانەت پەیامهێنەران و کەسە پیرۆزەکانش هەندێ کات لە خواست و فەرمانەکانی خودا لایان دەدا یان ئاگاداری نەدەمان، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە تاوانبارن، بەڵام عیسای مەسیح لە هەموو ژیانی خۆیدا، هەرگیز کارێك یان قسەیەك یان تەنانەت بیرکردنەوەیەك کە پێچەوانەی ئیرادەی پیرۆزی خودا بێت ئەنجام نەدا. دەیسا ئەو تەنها مرۆڤی بێ گوناهە.[105]**

**عیسا نەك هەر بەتەنها هیچ گوناحێکی ئەنجام نەدا، بەڵکو ئیرادەی وی، لەگەڵ ئیرادەی خودایی ئاسمان یەکسان بوو، لە**

---

[104](لەبەر ئەوەی خۆی ئازاری چەشتووە و تاقی کراوەتەوە، دەتوانێت یارمەتی ئەوانەش بدات کە تاقی دەکرێنەوە) ﴿عیبرانییەکان**2/18**تا**19**﴾

-(لەبەر ئەوەی ئەو سەرۆکە پایەبەرزەمان هەیە کە بەئاسماندا تێپەڕی، عیسای کوڕی خودا، بادەست بگرین بەو باوەڕەوە کە دانمان پێدا ناوە، چونکە سەرۆك کاهینێکمان نییە کە نەتوانێت هاوخەمی لاوازییەکانمان بێت، بەڵکو سەرۆك کاهینێکمان هەیە کە وەك ئێمە لە هەموو شتێك تاقیکراوەتەوە بەڵام بێ گوناه دەرچووە، بۆیە با بە متمانەوە لە تەختی نیعمەت بچینە پێش، بۆئەوەی بەزەی وەربگرین و نیعمەت بدۆزینەوە تاکو لە کاتی پێویستدا، یارمەتیمان بدات) ﴿عیبرانییەکان**4/14**و**15**و**16**﴾

[105](ئەوەی هیچ گوناهێکی نەکردبوو، فڕ و فێڵی لەسەر زار نەبوو) ﴿یەکەم پەترۆس/**2/22**﴾

-(ئەو دەرکەوت تا گوناهەکان لاببات، ئەو خۆی بێ گوناهە) ﴿یەکەم یۆحەنا/**3/5**﴾

**ڕاستیدا عیسا تاقانە مرۆڤێکی کاملە، کە لە ئەم جیهانەدا، ژیانی بە پاکی و بێخەوشی بردۆتەسەر.**

**ئەو کەسانەی کە کردەوەکانی مەسیحیان دەدی، شایەتی دەدەن کە دەسەلاتی وی سەرسورهێنەر بووە، ئەو ڕۆشنای دەگەڕاندەوە بۆچاوی نابینایان[106]، کاتێك خۆی و قوتابییەکانی سوار بەلەمێکی بچوك بوون و لە دەریاچەی جەلیل[107] دەپەڕانەوە، تۆفانێکی گەورە خەریك بوو بەلەمەکە قلێپکاتەوە، بەلام عیسا فەرمانی کرد بە ڕەشەبا و تۆفانەکە کە هێور بنەوە، دەست بەجێ هێور بوونەوە[108] پیاوێك بەناوی (لەعازر) کە چوار ڕۆژ بەسەر مەرگیدا تێپەڕیبوو، عیسا زیندووی کردەوە و لە گۆڕەکەی هێنایەدەرەوە[109] بەلام گرنگترین کاری سەرسوڕهێنی عیسای مەسیح ئەوەبوو، هەر بەو شێوەیەی پێشگۆی کردبوو، ڕۆژی سێیەم دوای مەرگی هەستایەوە و خۆی نیشانی هاوەلانی دا، چ کەسێك جگە عیسای مەسیح توانیویەتی ئەم کارانە بکات؟ چ کەسێك دەناسن کە لەناو مردواندا هەستێتەوە و هەرگیز نەمرێت؟ هیچ کەس! هەر لەبەر ئەمە ڕوونە کە ئەگەر چی عیسا مرۆڤ بوو، بەلام لە گەورەترین و بەدەسەلاتترین مرۆڤەکانی سەر ڕووی زەوی، گەورەتر و بەدەسەلات تر بوو، کەواتە ئەو کێیە؟!**

**بەو شێوەیەی کە پێشتر بۆم باسکردن، عیسا خۆی ئەو بانگەشەی کرد کە (کوڕی خودایە)، ئەو نەك تەنها لە کاتی دادگای کردنی خۆیدا لە شورای یەهود، بەلکو چەندین جار پێش دادگایی کردنی، ئەم بانگەشە گرنگەی لەبارەی خۆیەوە کردووە.**

**لەبەر ئەوە ئەو(خودا)ی بەزۆری بە(باوکی ئاسمان)ی ناو دەبرد، یەك جار وتی: (من و باوك یەکێکین)، دوژمنانی دەیانەویست بەردبارانی بکەن، لەبەر ئەوەی واهەستیان دەکرد عیسا خەریکی کفر کردنە، بەلام ئێمە باش دەزانین کە عیسا هەرگیز درۆزن و کفرگۆ نەبووە، وە تەواوی فەرمایشتەکانی ڕاست و دروست بووە.**

---

[106](دوو کوێر دوای عیسا کەوتن هاواریان دەکرد و دەیان وت: ڕۆلەی داود بەزەیت پێماندا بێتەوە، عیساش لێی پرسین: ئێوە باوەڕتان وایە من دەتوانم ئەمە بکەم؟ ئەوانیش وتیان بەلێ گەورەم.. ئەویش دەستی هێنا بە چاویاندا و وتی: بابۆتان ببێت بەپێی باوەڕتان، دەست بەجێ ڕووناکی گەڕایەوە بۆ چاوەکانیان) ﴿مەتتا**9**/**27**تا**31**﴾.

[107]دەریاچەی جەلیل، دەریاچەیەکی گەورەیە، ڕووباری ئوردنی پیادا تێپەڕدەبێت، کەوتۆتە ناوچەی جەلیل لە باکوری فەلەستین.

[108](کاتەك عیسا سەرکەوتە سەر بەلەمێك و قوتابییەکانی دوای کەوتن، لەناکاو ڕەشەبایەکی بەهێز هەلێکردە سەر دەریاچەکە، ئەوەندەی نەمابوو شەپۆلی ئاوەکە بەلەمەکە نقووم بکات، لەوکاتەدا عیسا نوستبوو، قوتابییەکانی چوونە لای و هەلیانساند و وتیان: گەورەم ڕزگارمان کە وا لەناودەچین، ئەویش پێی وتن: ئەی کەم باوەڕینە بۆچی دەترسن؟! دواتر عیسا فەرمانی دا بە ڕەشەبا و دەریاچەکە دەستوەجێ هێمنی بالی کێشا بەسەر ئەو ناوچەدا، هەموو سەریان سوڕما و وتیان: ئەمە چ مرۆڤێکە وا ڕەشەبا و دەریا گوێڕایەلی لێ دەکەن؟!) ﴿مەتتا**8**/**23**تا**28**﴾

[109](عیسا هاتە لای گۆڕەکەی "لەعازر" کە گۆڕەکەی ئەشکەوتێکی بچووك بوو، دەمەکەی بەردێکی پێوە نرابوو، عیسا فەرمووی: بەردەکە لادەن، مەرسای خوشکی مردووەکە پێی وت: گەورەم بۆنی کردووە ئێستا، ئەوە چوار ڕۆژە مردووە. عیساش پێی فەرموو: ئەی پێم نەگوتی ئەگەر باوەڕبکەیت شکۆی خواوەند دەبینیت؟ ئەوکات بەردەکەیان لابرد و عیساش پێش ئەوەی هیچ شتێك بکات چاوی هەلبڕی بۆ ئاسمان و فەرمووی: باوکە سپاست دەکەم کە گوێت لێگرتم، دەمزانی کە تۆ هەمیشە گوێم لێ دەگریت، بەلام لەبەر ئەوەی ئەم خەلکە لەو ناوە ڕاوەستاون ئەمەم گوت، تاکوو باوەڕبکەن کە تۆ منت ناردووە، عیسا کە ئەمەی گوت دوای بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: "لەعازر" وەرە دەرەوە! ئەوسا مردووەکە هاتە دەرەوە و دەست و قاچی بە کفن بەسترابوو، ڕووشی بە دەستمالێك پێچرابوو. عیساش فەرمووی: بیکەنەوە و بهێلن با بڕوات...) ﴿یۆحەنا**11**/**38**تا**45**﴾.

**دەبێ باش ئاگاداری ئەم خاڵە بین، کە ئەگەر کەسێك بڵێ: (عیسا کوڕی خودا نییە)، ئەوا عیسا بەدرۆزن دەزانێت و ئەگەریش درۆزن بێت ئەوا هیچکەس نابێت باوەڕ بەو بهێنێت. بەڵام کاتێك عیسا خۆی بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد کوڕی خواوەندە، لە ڕاستیدا هەمان فەرمایشتی خواوەندە کە لەکاتی تەعمید کردنیدا لە ئاسمانەوە بیسترا[110]لە هەموو نوسراوەکانی پەیامهێنەران چەندین جار دووبارە بۆتەوە کە عیسا کوڕی خودایە و ڕۆحی خودایە، زۆربەی زۆری مەسیحییەکانی جیهان لەم بانگەوازەی خۆیان ڕازین.**

**ئەڵبەتە ئاگادارن کە ئەم دەستەواژەیە_کوڕی خوا_ پێناسەیەکی جەستەی و ماددی نییە بەڵکو دەستەواژەیەکی ڕۆحانییە، ئەوە ڕۆشن و ئاشکرایە کە خودا هەرگیز لەگەڵ هیچ ژنێکدا هاوسەرگیری نەکردووە تا لەو کوڕێك بێتە بوون، وە ئەم قسانە بەلای ئێمەوە ناپەسەند و مایەی قبوڵ نییە.**

**لە ئینجیلدا، عیسا بە (کەلیمە/وشەی خودا)یش ناو دەبرێت، نازناوی (کوڕی خودا) پەیوەستی و یەکانەیی عیسا بە خودا، کە باوکی ڕاستەقینەی ئەوە نیشان دەدات، بەڵام نازناوی(وشەی خودا) بە ئێمە دەڵێت کە خودا بەهۆی عیسای مەسیح لەگەڵ تەواوی مرۆڤانی سەر ڕووی زەوی قسە دەکات، پەیامی خۆی دەگەیەنێت و لێیان تێدەگات، وە لەم بارەشەوە لە ئینجیلدا نوسراوە کە:**

**"سەرەتا وشەکە هەبوو[111]، وشەکە لای خواوەند بوو، ئەو لە سەرەتاوە لای خواوەند بوو، هەموو شتێك بەو بەدی هاتووە، بێ ئەو هیچ شتێك بەدی نەهاتووە لەوانەی کە بەدی هاتوون، وشەکە سەرچاوەی ژیان بوو، ژیانەکەش ڕوناکی مرۆڤ بوو، ڕووناکیەکەش لە تاریکیدا دەدرەوشێتەوە و تاریکییەکە بەسەریدا زاڵ نەبووە[112]..."[113]**

**دواتر نوسراوە کە:**

**"وشەکە بوو بەمرۆڤ و لە نێوانماندا نیشتەجێ بوو، شکۆی ئەومان بینی، وەك شکۆی تاقانەیەك لە باوکەوە، پڕ لە نیعمەت[114] و ڕاستی..."[115]**

**مەبەست لەم ئایەتانەی سەرەوە ئەوەیە کە خودا پێشتر بەهۆی پەیامهێنەران و کتێبەکانیانەوە خۆی نیشان داوە، لە کۆتایدا**

---

[110](ئەمە ڕۆڵەی خۆشەویستی منە، ئەوەی زۆر پێی دڵشادم) ﴿مەتتا**17/3**﴾.

یان :

(تۆی ڕۆڵەی خۆشەویستم، ئەوەی زۆر پێت دڵشادم) ﴿مەرقۆس**11/1**﴾

[111]وشەکە: لە زمانی یۆنانی پێی دەگوترێت(لۆگۆس)کەواتایەکی فراوانی هەیە، زۆرتر بە واتای دانایی خواوەند، یان پەیامی خواوەند دێت، بڕوانە:

﴿عیبرانییەکان**11:3**﴾ و ﴿زەبوورەکان**6:33**﴾ و ﴿پەیدابوون**5:1**﴾

[112]وشە لەم شوێنەدا و بە یۆنانیەکەی دوو واتای هەیە: زاڵبوون و تێگەشتن

[113] ﴿یۆحەنا**1/1**تا**6**﴾

[114]نیعمەت: بەخششەکانی خواوەند، بەبێ شایستە بوون، بە تایبەت لێ خۆشبوونی گوناە و لێخۆشبوونی هەتاهەتایی.

[115]﴿یۆحەنا**1/14**تا**15**﴾

**خۆی به شێوەیەکی تەواو و ڕوون لـەسەر شێوەی مرۆڤێکی کامڵ ئاشکراکرد. ئەم مرۆڤە کامڵەش پەیامهێنەرێکی زۆر گەورەیە و لـە بێ گومان لـەگەڵ (خودا)دا یەکێکە، هەروەها ئەم ئایەتانەی نێو ئینجیل بە ئێمە دەڵێن کە ئەم کەسایەتییە (وشەی خودا) و (کوڕی خودا)یە. عیسا لـە سەرەتاوە لـەگەڵ خودا یەکێك بووە، وە هەموو شتێکیش بەهۆی ئەوەوە دروست بووە، کەواتە لـەو کاتەی کە بڕیاری لـەسەر دراوە، کەلامی ئەبەدی و ئەزەلی خودا کە لـە ڕەحمی مریەمی پاکیزەدا بەرگی بەشەری پۆشی و بە وێنەی عیسای مەسیح خۆی نیشان دا. کەوابوو ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە ئەو خاوەنی دوو سروشت یان دوو (بار) بووە، سروشتێکی ئیلاهی و سروشتێکی مرۆڤی، عیسای مەسیح هەم (خودا)یە و هەم (مرۆڤ).**

**یەکەمین کەسانێك، کە بە عیسا باوەڕیان هێنا و بوونە (رسولان/نێردراوانـ)ـی ئەو، خۆیان یەهوودی بوون و بە یەکتا پەرستی و تاکایەتی خودا باوەڕێکی تەواویان هەبوو، هێشتایچ دوای ئەوەی کە دوو ساڵ لـەگەڵ عیسادا ژیانیان گوزەراند، دڵنیاییەکی تەواویان هەبوو کە عیسا لـەگەڵ خودا یەکێکە و بەڵگەش بۆ ئەم قسیەیە دانپیانانەکەی پەترۆسە کە وتی:**

**"تۆ مەسیحی، کوڕی خودای زیندوو..."[116]**

**هەروەها تۆماس[117] کاتێك عیسای مەسیحی بە زیندووی دوای مەرگ بینی، هاواری لێ هەستا و وتی:**

**"ئەی خاوەن شکۆ، ئەی خودا من..."[118]**

**لـە هەردوو بارەکەدا، عیسا قوتابیەکانی خۆی ستایش کرد و بە تۆماسی وت:**

**"دوای بینینم باوەڕت هێنا؟ خۆش بە حاڵی ئەوانەی کە نامبینن و باوەڕم پێدەهێنن..."[119]**

**ئەم (خۆش بە حاڵی ئەو کەسانەی نامبینن و باوەڕم پێ دێننـ)ـەی عیسا فەرمووی، ئەمڕۆکە بە نسیبی ئێمە دەبێت، بە مەرجێك باوەڕمان هەبێت کە ئەو کوڕی خودایە.**

**ئێستا لـەوانەیە بپرسن: (لـە کاتێکدا کە خودا یەکە، چلۆن ڕێی تێدەچێت کە عیسای مەسیح لـەگەڵ خودا بوبێت هەر لـەسەرەتاوە و لـەگەڵ ئەویش یەکێك بێت؟) لـە ڕاستیدا ئەم بابەتە هێندە نهێنی و باڵایە کە عەقڵ و تێگەشتنی ئێمە، زۆر**

---

[116] ﴿مەتتا**16/16**﴾

[117] تۆماس: یەکێکە لە دوانزە قوتابییەکە و بە دیدمۆسیش ناسراوە_واتە جمکانە_ لە ئینجیلدا لە بارەی ئەم کەسەوە نوسراوە کە:

(تۆماس یەکێکە لە 12قوتابییەکە و بە دیدمۆس ناسراوە، لەگەڵ قوتابییەکان نەبوو کاتێ عیسا هات، قوتابییەکانی کە پێیان وت: گەورەمان بینی، ئەویش گوتی: ئەگەر جێگای بزمارەکان بەدەستییەوە نەبینم، پەنجە نەخەمە شوێنی ئەو بزمارانەی کە پێیەوە داکوتران، دەست لە کەللەکەی نەدەم هەرگیز باوەڕ ناکەم، لە دوای هەشت ڕۆژ قوتابییەکانی دیسانەوە لە ژوورەوە بوون و تۆماسیش لەگەڵیان بوو، دەرگاکانیش داخرابوو، عیسا هات و لە ناوەڕاستیان ڕاوەستا، فەرمووی: سڵاوتان لێ بێت!

ئینجا بە تۆماسی وت: پەنجەت بێنە ئێرە و دەستم ببینە، دەستت بێنە و لە کەلەکەمی بدە بێباوەڕمەبە بەڵکو باوەڕبهێنە...) ﴿یۆحەنا**24/21**تا**28**﴾

[118] ﴿یۆحەنا**28/20**﴾

[119] ﴿یۆحەنا**29/20**﴾

لەوە سنوردارترە پەی پێ ببات، چ کەسێك جگە لە خودا خۆی، دەتوانێت بە بوون و جەوهەری خودا پەی ببات؟ بەڵام دەبێ ئەوە بزانین خودا بە دەسەڵات و ڕەهایە، هەر شتێك پێچەوانەی ویست و ئیرادەی پیرۆزی وی نەبێت، بۆ ئەو نا مومکین نییە.

ئێمە بەهۆی ئەو شتانەی کە لە سروشتدا لەلایەن خودا ئافرێنراون، دەتوانین هەرچەندە بە شێوەیەکی کەمیش بێت، نمونەیەك لە ئەم نهێنییە یان ئەم هەقیقەتە ئیلاهییە ببینین و درکی پێ بکەین، لە خۆر بنوارن کە لە ئاسماندا شوێنێکی گرتووە و بە شێوەیەك مەزن و گەرم و پڕتینە کە ئەگەر نزیك بێتەوە لە زەوی، هەموو شتێك لە تاویدا دەبێتە پەلەپڕوز و لەناو دەچێت، خۆر و ڕوناکی خۆر کە دوو شتی یەك سەرچاوەن و لە تەك یەکتر جیا نین، کاردەکەن و لە چالاکیدان و بەم دونیایەی ئێمە ڕوناکی و گەرما _کە هەردووکیانمان پێویستە_ دەبەخشن.

بە هەمان شێوە خودای گەورە، ڕوناکی و نوری خۆی لەگەڵ خۆی یەکێکە، ڕوناکی خۆی دەخاتە سەر دونیای ئێمە، تا ژیان بە ئێمە ببەخشێت، خودا ئەم نور و ڕوناکییەی خۆی بە(کوڕی خۆی) یان (وشەی خۆی) ناودەبات و ئەم ڕوناکییە لەسەر شێوەی عیسای مەسیح وەدەرکەوت، لەم بارەوە عیسا دەفەرموێت:

"منم ڕوناکی جیهانیان، ئەوەی دوام بکەوێت هەرگیز بە تاریکیدا ناڕوات، بەڵکی ڕوناکی ژیانی دەبێ..."[120]

کاتێك کە لە ڕوناکی عیسا ڕادەمێنین ئەوا ڕوناکی خودا دەبینین، کاتێك لە عیسای مەسیح دەڕوانین ئەوا لە خودامان ڕوانیوە، هەروەك عیسا خۆی فەرموی:

"هەرکەس من ببینێت، ئەوا باوکم_واتەخودا_ی بینیوە..."[121]

کەوابوو ئێمەی مەسیحی دڵنیاین لەوەی کە خودامان، بەهۆی کوڕەکەیەوە _واتە عیسای مەسیح_ بۆلای ئێمە دابەزیوە و هاتووە.

هاوڕێی بەقەدرم..

ئایا جێگەی سەر سوڕمانە بۆ ئێوە خودای بە دەسەڵات و ڕەها، بۆ ڕزگاری مرۆڤانی گوناهکار بەم شێوەیە هاتبێتە جیهانەوە؟ بەڵام لە بیری نەکەن، خودایەك کە بێ ئەندازە گەورەیە تەواوی کارەکانی خۆی لە ڕووی خۆشەویستییەوە ئەنجام دەدات و بەهۆی هاتنی بۆ ئەم جیهانە لەنێو کەسایەتی عیسای مەسیحدا، خۆشەویستی ئیلاهیی خۆی بەتەواوی بۆ ئێمە ئاشکرا کردووە.

بێگومان ئێوە داستانی ئەو پادشا دادپەروەرەتان بیستووە کە خەڵکانی سەرزەمینی خۆی زۆر خۆشدەویست، ئەم پادشایە هەستا کورسی پاشایەتی خۆی جێهێشت و جلی هەژارانی دەپۆشی و دەچوویە نێو ماڵی لێقەوماوان و هەژارانی

---

[120] ﴿یۆحەنا 12/8﴾

[121] ﴿یۆحەنا 9/14﴾

سەرزەمینەکەیەوە تا زیاتر لـە ئێش و ئازار و گرفتەکانیان حاڵی بێت و ئەو سەرما و گەرما و نەخۆشیانەی کە بەر خەڵکەکەی دەکەون بەر ئەمیش بکەون، بۆ ئەوەی زیاتر لێیان تێبگات و باشتر بتوانێت خزمەتیان بکات، ئەڵبەتە ئەم نموونە سادەیە کە بەس نییە، تا ڕادەیك دەتوانێت بۆ ئێمەی ڕوون کاتەوە کە چۆن چۆنی کوڕی خودا، لـەگەڵ باوکدا یەکێك بوو، شکۆ و پایەیی ئاسمانی خۆی بەجێهێشت و هاتە سەرزەوی و وەك مرۆڤێکی هەژار ژیا، تا خۆشەویستی قوڵی خودا بۆ مرۆڤ ئاشکرا بکات و مرۆڤ بەرەو لای خودا ڕێنوێنی کات. ئەم جۆرە لـە خۆشەویستی زۆر سەر سوڕهێن و بەنرخە بۆ ئێمە.

**(بەشی هەشتەم)**

# کاری عیسای مەسیح لـە جیهاندا چی بوو؟

**بەو شێوەیەی ئاماژەمان پێدا، عیسا هاتە جیهانەوە تا خودا بە مرۆڤ بناسێنێت، وە مرۆڤ لـە خودا نزیك بکاتەوە، وە ڕێگا خۆش بکات و پاکی کاتەوە بۆ ئەوەی پادشایەتی ئاسمان[122] بهێنێتە سەر زەوی. لـە بەشی دووەمدا ڕوونم کردەوە کە چۆن چۆنی مرۆڤ لـە دژی خودا تاوانی ئەنجام دا، نەك تەنها بەهۆی ئەنجامدانی تاوانەوە لـە خودا جیابوویەوە، بەڵکو بەشێوەیەك بێ تواناش بوو کە ئیتر نەی دەتوانی بە تەنها توانای ئەوەی هەبێت، گوێڕایەڵی خودا بکات و لـە نزیکی ئەو ژیان بگوزەرێنێت، هەر لـەبەر ئەمە خودا بڕیاری دا دڵی مرۆڤ پاك بکاتەوە کە لێوان لێوی تاوانکاری و بەدکاری بوو بوو، تا مرۆڤ برەو بدات بە خۆیی و سەرلـەنوێ هێز بداتەوە بەر خۆی کە خودای خۆش بوێت و گوێدێری بکاتەوە. خودا ئەمەی چۆن ئەنجام دا؟**

**ئێستا هەوڵدەدەم یەکێك لـە گرنگترین بنەماکانی بیروباوەڕی مەسیحیەتتان بۆ ڕوون کەمەوە.**

**هەروەك لـە پێشتردا وتم، خودای پیرۆز بە ئادەم و حەوای فەرموو ئەگەر لـە فەرمانەکانی سەرپێچی بکەن ئەوا دەمرن، دایك و باوکی سەرەتاییمان_ئادەم و حەوا_ سەرپێچیان لـەو فەرمانەی خودا کرد لـە بارەی خواردنی میوەی درەختی چاکە و خراپە و خوداش ئەوانی بە مەرگ مەحکوم کرد. بەڵام وێڕای ئەوەی ئەوانی سزا دا، گفتیشی پێدان تا ئەوان و وەچەکانیان بە گشتی نائومێد نەبن، شەیتان لـەسەر شێوەی مار دەرکەوتبوو، وە ئەوانی فریودابوو، هەر لـەبەر ئەمە خودا بەوانی ڕاگەیاند کە کەسێ لـە بنەچەی ئەوان (لـە ژن) دەهێنێتە بوون، سەری ئەو مارەی فریویداون پان دەکاتەوە و لـەژێر پێی ئەودا ئەو مارە لـە نێو دەبات، بەڵام خۆشی بریندار دەبێت.[123]**

**مەبەستی خودا ئەوە بوو کە ڕزگاریکارێك لـە ژنەوە دێتە بوون و شەیتان لـەناو دەبات وەك تۆڵـەیەك، بەڵام لـە ئەنجامی ئەم کارەیدا خۆشی بەهۆی شەیتانەوە بریندار دەبێت. ئەمە یەکەمین گفت بوو لـە بارەی هاتنی عیسای مەسیحەوە، کە کوڕی مریەم بوو، وە تەنها بە هۆی ژنێکەوە هاتە بوون بێ دەستێوەردانی پیاو، وە بەهۆی کارە باشەکانییەوە لـە خاچ درا و لـەبەر گوناهکاران و بەهۆی هەستانەوەشی لـەناو مردوان، شەیتانی شکست پێهێنا.**

**دوای ماوەیەکی زۆر، خودا گفتێکی ڕوونترو تەواوتری بەهۆی (ئیشایا)ی پەیامهێنەوە ڕاگەیاند. ئیشایا لـە کتێبەکەی**

---

[122] پادشایەتی ئاسمان یان (شانشینی خودا): ئەم پادشایەتییە لە ئاسمانە و خودا خۆی پاشایەتی و خواستی خودای تێدا پەیڕەو دەکرێت، مرۆڤیش کاتێك باوەڕدەهێنێت و بە ڕۆح لەدایك دەبێتەوە، ئەوا دەبێتە ئەندام و داردەستی خودا لەو پادشایەتییە و بەپێی خواستی ئەو دەژی. پاش ئەوەی مژدە دەدرێتە هەموو گەلان، لە دووەم هاتنەوەی مەسیحدا ئەم پادشایەتییە دێتە سەر زەوی. بڕوانە: ﴿ئاشکراکردن**21**﴾ و ﴿یۆحەنا**3/3**تا**5**﴾ و ﴿مەتا**17/4**﴾

[123] (دوژمنایەتیش دەخەمە نێوان تۆو ئافرەتەکە، نێوان نەوەی تۆو ئەوەوە، نەوەی ئەو سەرت پان دەکاتەوە_واتە مەبەستی خاچی مەسیحە کەدواتر هات و دەسەڵاتی شەیتانی تێکدا_ بەڵام لەئەنجامی ئەمەدا کە دەیهێنێت بەسەر شەیتاندا خۆی پاژنەی پێی ئەکوترێت ) ﴿پەیدابوون**3/15**تا**16**﴾

**خۆیدا، کە بە سەدان ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح نوسیبووی، لەبارەی هاتنی کەسێك پێشگۆی دەکات کە لە جێگای گوناهکاران هەڵگری ڕەنج و ئازار و مەرگ دەبێت تا لێخۆش بوون بۆ ئەوان بەدەست بێنێ.**

**بەم شێوەیە ئیشایا پێشگۆییەکەی کردبوو:**

**"کێ باوەڕی بە پەیامەکەمان کرد و هێزی یەزدان بۆ کێ دەرکەوت؟ بەندەکە وەك چەکەرە لە بەردەمی باڵای کرد، وەك ڕەگ لە خاکێکی تینوو گەشەی کرد، نە جوانی هەبوو نە پایەبەرزی هەتا سەرنجمان بۆی بچێت، نەدیمەن هەتا ئارەزووی بکەین، ڕیسوا و سووك لەلایەن خەڵکەوە، پیاوی ئازار و شارەزای ناخۆشی. وەك یەکێك خەڵك ڕووی خۆیانی لێ بشارنەوە ڕسوا بوو، بە هیچمان نەزانی، بە دڵنیاییەوە دەردەکانی ئێمەی هەڵگرت، ئازارەکانی ئێمەی برد، ئێمەش واماندەزانی لەلایەن خوداوە گورزی بەرکەوتووە، لێدراوە و زەلیلە، بەڵام ئەو لەبەر یاخیبووان بریندار بوو، لەبەر تاوانەکانمان ورد و خاش کرا. ئەو لە پێناوی ئاشتبوونەوەی ئێمە سزای چێژت، بە برینەکانی ئەو چاك بووینەوە. هەموو وەك مەڕ بڵاوەمان کردووە، هەریەکە ملی ڕێگای خۆمان گرتووە، بەڵام یەزدان هەموو تاوانەکانی ئێمەی خستە سەر ئەو، زەلیل کرا و ستەمیان لێکرد، بەڵام دەمی نەکردەوە، ئەو وەك مەڕ بۆ سەربڕین بردرا و وەك چۆن مەڕێك لەبەر دەستی ئەوانەی خوریەکەی دەبڕنەوە بێدەنگە، ئەو دەمی نەکردەوە.."[124]**

**ئەم ڕزگاری کارەی کە خودا گفتی هاتنی دابوو، وەك قوربانی بۆ تاوانەکانی تەواوی مرۆڤایەتی گیانی خۆی بەخشی. هەر بەو شێوەیەی لە پێشتردا ڕوونم کردەوە، ئەوە ڕێك ئەو کارە بوو کە عیسای مەسیح ئەنجامی دا، یەحیای لە ئاوهەڵکێش_تەعمیددەر_ وتی کە عیسا بەرخی خودایە، تاوانی جیهان لەئەستۆ دەگرێت[125]. عیسا خۆشی پێش مەرگی فەرمووبوی خوێنی ئەو بۆ لێخۆشبوونی تاوانەکانی مرۆڤ دەڕژێت.[126] کەواتە بەویستی خۆی، خۆی ڕادەستی جەلادان کرد تا ببێتە قوربانی.**

**ئەو بە بەخشینی گیانی خۆی بۆ ڕزگاری کردنی گوناهکاران، خۆشەویستی خودای بۆ مرۆڤ نیشاندا و بەقەولی پۆڵسی نێردراو:**

**کاتەك ئێمە هێشتا گوناهکار بووین، عیسای مەسیح لە پێناو ئێمەدا گیانی سپارد[127]، عیسا فەرمووی: خودا جیهانی ئەوەندە خۆش دەوێت کە کوڕە تاقانەکەی خۆی کردە قوربانی تا هەرکەسێك بەو باوەڕدەهێنێت بە هیلاکدا نەچێت،**

---

[124]﴿ئیشایا **52/1**تا**8**﴾

[125]﴿یۆحەنا **1/29**﴾

[126](ئینجا عیسا جامێکی هەڵگرت و سوپاسی خودای کرد، دای پێیان و وتی: هەموو لێی بخۆنەوە، چونکە ئەمە خوێنی منە بۆ پەیمانی نوێ، ئەو خوێنەی لەپێناوی زۆر کەس دەڕژێ، بۆ بەخشینی گوناهەکان..) ﴿مەتا **26/27**تا**29**﴾

[127](کاتێك هێشتا لاواز بووین، مەسیح لە کاتی دیاری کراودا لە پێناو گوناهباران مرد. لەبەر ئەوەی بە دەگمەن کەسێك لە پێناو مرۆڤێکی ڕاست و دروست دەمرێت، لەوانەیە لەپێناو کەسێکی باش مرۆڤ بوێرێت بمرێت. بەڵام خودا خۆشەویستی خۆی بۆ دەرخستین، بەوەی عیسای مەسیح لەپێناو ئێمەدا مرد، کاتێك هێشتا گوناهکار و هەڵەکاربووین.) ﴿ڕۆما **5/6**تا**9**﴾

بەڵکی ژیانێکی هەمیشەیی بەدەسیت بهێنێت.[128] هیچ کەسێك، تەنانەت ئەگەر پەیامهێنەریش بێت، بەشێوەیەك باش و کامڵ نییە کە بتوانێت بۆ تاوانەکانی تەواوی خەڵکی، یان تەنانەت بۆ تاوانەکانی خودی خۆشی ببێتە قوربانی، لەم ڕووەوە خودا لە سایەی ڕەحمەت و خۆشەویستی خۆیەوە، لەنێو عیسای مەسیحدا خۆی نیشاندا تا ئێمە بگەڕێنێتەوە بۆلای، بەهۆی مەرگی کوڕە خۆشەویستەکەیەوە کە لەگەڵ خۆیدا یەکسانە، خودا سزای لەسەر هەموو ئەوانە هەڵدەگرێت کە بە عیسای مەسیح باوەڕدەهێنن. کوڕی خودا بە شێوەیەك پلەی باڵایە کە تەنها یەکجار قوربانی بوونی وی بۆ کەفارەتی هەموو گوناهەکانی جیهان بەسە، هەر لەبەر ئەمەشە قوربانییەکی تر بۆ کەفارەتی گوناهەکانی مرۆڤ پێویست نییە. کەوابوو عیسای مەسیح بەهۆی ئەو مەرگەی کە خۆی پێی ڕازی بوو لەسەر خاچێك، دیوار و بەربەستی جیایی و دووری لە نێوان مرۆڤ و خودای لەناوبرد و کاری بۆ گوناهکاران ئاسان کرد تا لێخۆشبوون بەدەست بهێنن و نزیك ببنەوە لە خودای پیرۆز.

عیسای مەسیح نە تەنها باشتر لە هەموو کەسێك خودای ناساند، بەڵکو بەهۆی ژیانی پیرۆزی خۆی و خۆشەویستی بێ پایانی، خۆی بە مەرگ سپارد بۆ ئێمەی تاوانبار، ئیرادە و ویستی خودای بۆ ئێمە ئاشکرا کرد.

(کەسێکی باوەڕدار ڕۆژێك لە ئێران بەمنی گوت: پێش ئەوەی ببم بە مەسیحی، وابیرم دەکردەوە خودا دەناسم، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوم نەناسیبوو، تەنها کاتێك توانیم خودا بەڕاستی بناسم کە ئەوم لەنێو مەسیحدا بینی...)

پێش ئەوەی ئەم بەشە، کە دەربارەی عیسای مەسیح بوو بەکۆتای بگەیەنم، پێم خۆشە برێ لە ناونیشان و تایبەتمەندییەکانی ئەوتان وەبیر بهێنمەوە:

**1**– ناوی ئەو (عیسا)یە، لە وشەیەکی عیبرییەوە هاتووە بەمانای"یەهوە_خودا_ ڕزگاری کارە" [129].

**2**– ناونیشانی ئەسڵی ئەو (مەسیح) بەمانای(مەسح کراو)دێت، ئەو لەڕێگەی خوداوە مەسح کرا تا پادشای هەمیشەی بێت.[130]

**3**– ئەو(عەمانوئێل)ە، واتە "خودا لەگەڵمانە".

---

[128](چونکی خودا بەم جۆرە جیهانی خۆش دەویست، تەنانەت تاقە ڕۆڵەی خۆی پێشکەش کرد، هەتا هەموو ئەوانەی باوەڕی پێدەکەن لەناونەچن، بەڵکو ژیانی هەتا هەتای بەدەست بهێنن چونکە خودا ڕۆڵەی نەنارد بۆ تاوانبارکردنی جیهان، بەڵکی ناردی تا جیهان ڕزگار ببێت بەهۆی ئەوەوە.) ﴿یۆحەنا **16/3**تا**18**﴾

[129]لە(یێسوس)ی یۆنانییەوە وەرگیراوە، بەعیبری پێی دەگوترێت (یەهۆشەع) یان (یەشوع)، واتە خودا ڕزگار دەکات.

[130]لە وشەی(مەشیا)یی عیبرییەوە هاتووە، بە واتای دەستنیشانکراویش دێت، تەنها پادشا و پێغەمبەر و کاهین لای جولەکەکان دەست نیشان دەکران، ئەویش بە چەورکردنیان، بە پێی پێشبینییەکانی پەیمانی کۆن، جولەکەکان چاوەڕێی ئەو کەسەیان دەکرد کە دێت وەکو ڕزگاریکار و لەهەمانکاتیش کاری پادشا و پێغەمبەر و کاهینیش دەکات، بەڵام کە هاتیش باوەڕیان پێنەکرد، چونکە لایان وابوو لە دەستی ڕۆمەکان ڕزگاریان دەکات، نەیانزانی هاتووە لەگوناهەکانیان ڕزگاریان بکات.

**4– ئەو (کوڕی خودا)یە.[131]**

**5– ئەو (وشەی خودا)یە.[132]**

**6– ئەو (کوڕی مرۆڤ)ــە[133]. ئەوە هەر ئەو ناونیشانەیە کە عیسا زۆر کات بەکاری دەهێنا، ئەو هەم خودایە هەم مرۆڤ.**

**7– ئەو (پەیامهێنەری خودا)یە.**

**8– ئەو(ڕزگاری کاری جیهان)ە.**

**9– ئەو (پادشای پادشایان)ە.**

**10– ئەو (خودایە).**

**11– ئەو (ڕێگا)یە.**

**12– ئەو (حەقیقەت)ە.**

**13– ئەو (ژیان)ە.**

**14– ئەو (خۆراکی ژیان)ە.**

**15– ئەو (تەنها حەقیقەت)ێکە.**

**16– ئەو (مرۆڤێکی تەواو و کامڵ)ە.**

**17–ئەو (حاکم)ە.**

**18– ئەو (کاهینی گەورە)یە.**

**19–ئەو (پەسڵان)ە.**

**20–ئەو (خودای بەشکۆ)یە.**

---

[131] بە مەسح دەگوترێ کوڕی خودا، چونکە لە تێگەشتنی جولەکەکان، یەکێکە لە ناونیشانەکانی مەسیح، ئەمەش واتای ئەوە نییە مەسیح لەنجامی پەیوەندی سێکسی لە نێوان مریەم و خودا هاتۆتە بوون..حاشا! ئەمە گەورەترین کفرە، بەڵکو ڕۆحییەن کوڕی خودایە، چونکە مەسیح هەموو سروشتی خودای تێدابوو، وەك: پیرۆزی و دەسەڵات و ڕاست و دروستی و بەزەیی و خۆشەویستی و دانایی و...هتد، بروانە: ﴿زەبووری**110/2**﴾ و ﴿لۆقا**35/1**﴾

[132] وشەکە: بە یۆنانی دەبێتە (لۆگۆس). مەبەست لەوشەی خودایە لە سەرەتاوە لەگەڵ خودا بووە، هەموو شتێکیش بەم وشەیە دروست بووە، ئەم وشەیەش لە عیسای مەسیح بەرجەستەبووە، بڕوانە﴿یۆحەنا**1/1**﴾

[133] بە مەسیح گوتراوە، چونکە سروشتی مرۆڤی تێدابوو، لە برسیبوون و تینووبوون و ئازارچەشتن و غەمخواردن و ...هتد، بڕوانە ﴿دنیاڵ**13/7**تا**15**﴾ و ﴿مەتا**13/16**﴾

(بەشی نۆیەم)

# لـە ئاینی مەسیحدا چۆن لـێخۆشبوون خودا بەدەست دەهێنرێت؟

**هاورێی هێژام**

ئێمە ئەوە باش دەزانین کە گوناهکارین، وە دەبێ داواکاربین لـە خودا کە ڕێگامان نیشان بدات و بەرچاومان ڕوونکاتەوە بۆ ئەوەی بزانین چی بکەین تا لـێمان خۆش بێت و قبوڵمان بکات لای خۆی.

وەك ئاشکرایە بیروباوەڕ و ڕای زۆر لـەم بارەوە بوونیان هەیە، هەندێ لـە خەڵکی وا بیردەکەنەوە لـەبەر ئەوەی نەژادێکی تایبەتن یان پەیڕەوی فڵانە مەزهەبێکن ئەوا بەبێ شك لـێخۆش بوونی خودایان بەدەست هێناوە، هەندێکی تر باوەڕیان وایە کە بەهۆی ئەنجامدانی کاری باشەوە دەتوانن بەدکارییەکان و تاوانەکانی خۆیان قەرەبووکەنەوە و لـەم ڕێگایەوە ڕزگاری خۆیان بەدەست بهێنن لـە سزا، وە هەندێکی تریش ئومێدەوارن کە یەکێ لـە پەیامهێنەران یان کەسایەتییە پیرۆزەکان دوعایان بۆبکات و خودا ڕازی کات بەوەی کە لـە ئەوان خۆش ببێت، بەڵام کتێبی پیرۆز ئێمە فێردەکات کە بەهۆی هیچکام لـەم ڕێگانەوە ناتوانین ڕزگاری هەمیشەی بەدەست بهێنین، هیچ مرۆڤێکیش بەڕادەی پێویست ئەوەنە باش نییە کە جێگای ڕەزامەندی خودای پیرۆز بێت.

ئایا هیچ ئومێدێکی تر بۆ ئێمەی گوناهکار بوونی نییە؟ بەڵێ! هەیە... خودای پیرۆز سەنا بکەن، هیوایەك بۆ ئێمە بوونی هەیە!

ئەو شتەی ئێمە نەمانتوانی بۆ خۆمان ئەنجامی بدەین و ئەو شتەی هیچ پەیامهێنەرێکیش نەیتوانی بۆ ئێمەی ئەنجام بدات، خواوەند لـە سایەیی میهر و خۆشەویستی خۆیەوە ئەنجامی دا، لـە کتێبی پیرۆز نوسراوە کە:

"ئەوە کە کەفارەتی گوناهەکانمانە[134] و نەك گوناهەکانی ئێمە بەڵکو گوناهی تەواوی مرۆڤانی جیهان، ئەگەر بە ڕوناکیدا برۆین هەروەك چۆن خودا لـە ڕوناکیدایە، ئەوا لـەگەڵ یەکتری پێکەوە دەژین و خوێنی عیسای کوڕی خودا لـە هەموو گوناهێك پاکمان دەکاتەوە، ئەگەر بڵێین گوناهمان نییە، ئەوا خۆمان هەڵدەخڵەتێنین و ڕاستی لـە ئێمەدا نییە، ئەگەر دانمان بە گوناهەکانماندا نا، ئەوا خودا دڵسۆز و دادپەروەرە، لـە گوناهەکانمان خۆش دەبێت و لـە هەموو ناڕەواییەك پاکمان دەکاتەوە"[135]

کەواتە ڕێگای خودا بۆ ئێمە ئاوەڵایە تا بە هۆیەوە بۆلای ئەو هەنگاو هەڵگرین و مایەی قبوڵی ئەو واقیعە بین، بەمەرجێك بە عیسای مەسیح واتە قوربانی ڕاستەقینەی تاوانەکان، باوەڕبهێنین و جگە لـەم ڕێگایە ڕێگایەکی تر بوونی نییە. هەروەك

---

[134] ﴿یەکەم یۆحەنا 2/2﴾

[135] ﴿یەکەم یۆحەنا 1/7تا10﴾

**عیسا دەفەرمووێت:**

**"منم ڕێگا و ڕاستی ژیان، کەس نایەتە لای باوك لـە ڕێگەی منەوە نەبێت. ئەگەر ئێوە منتان بناسیایە، باوکیشمتان دەناسی"[136]**

**خودا کوڕی خۆی نارد تا هەموو خەڵکی جیهان ڕزگاربکات، عیسای مەسیح هەمووان بانگهێشت دەکات بەرەو لای خودا بگەڕێنەوە.**

**ئەو وتی: ئەو کەسەی کە بەرەو پیری دەچن جیاوازە و هەرگیز دەست نانێت بەڕووتانەوە و ڕوتان لیٚ وەرناگیٚرێت، مانای ئەم فەرمایشتەی عیسا ئەوەیە کە هەرکەسێك لـەم جیهانەدا لـە گوناهەکانی خۆی دەست هەڵگرێت و ڕاستگۆیانە تۆبە بکات و عیسای مەسیح کە کوڕی خودایە، وەك ڕزگاریکاری خۆی هەڵبژێرێت، ئەوا بێگومان لێخۆشبوونی خودا بەدەست دەهێنێت.**

**پیر و گەنج، هەژار و زەنگین، خۆنەوار و نەخۆندە، چاك و خراپ، دەتوانن ڕوو لـەو بنێن، بەڵام دەبیٚ بزانین کە ئیمان بە عیسای مەسیح تەنها ئەوە نییە کە خۆمان بە ئەو بسپێرین، هەروەك چۆن نەخۆشێك خۆی بە پزیشکێکی زرنگ دەسپێرێت و متمانە بە ئەو دەکات کە شیفای بات.**

**ئێمەی مەسیحی خۆشحاڵین کە عیسای مەسیح پێچەوانەی موسا و باقی پەیامهێنەرانی تری پێشین، نەمردووە و لـە گۆڕێکدا نەنێژراوە، ئەو زیندووە و ڕۆحییەن لـەگەڵ ئێمەدایە، هەر بەو شێوەیەی کە چۆن زوو وەك مرۆڤێك لـە فەڵەستیندا دەژیا، نەخۆشانی شیفا دەدا، باوەڕمان وایە ئاوهاش ئەمڕۆکە هەروەك پێشوو، ئێمەش لـە ناسازگاری و ناهەمواربیەکانی ژیان ڕزگار بکات.**

**عیسای مەسیح هەروەك ڕوناکی خۆر، لـەسەر زەوی تەك ئێمەدایە و لـە ئاسمانیش لـەگەڵ باوکی ئاسمانیدا دانیشتووە، ئەو هەمیشە لـە حزوری باوکدایە لـەو شوێنەدا بۆ ئەو کەسانەی کە بە ئەو باوەڕیان هەیە، نزا دەکات.**

**لـە کتێبی پیرۆزدا نوسراوە کە:**

**"لـەم ڕووەوە ئەو باڵادەستە، ئەوانەی کە بەهۆی ئەوەوە بەرەو ڕووی خودا دەچن، ڕزگاری هەمیشەیی بەدەست دەهێنن، چونکە ئەو هەمیشە زیندووە تا هێڤی_شەفاعەت_ بۆ ئەوانە بخوازێت کە دەگەڕێنەوە بۆلای"[137]**

**مەرگی عیسا لـەسەر خاچێك لـە پێناو ئێمە و نزای هەمیشەی ئەو بۆ ئێمە نەك تەنها بۆ ڕزگاری ئیمانداران لـە جەهەنەم گرنگ و پڕ بایەخە، بەڵکو دەتوانێت ئێمە لـەم جیهانە پڕ لـە تاوانکاریەدا کە تێیدا دەژیین، پاك و پیرۆز و بیٚ خەوش**

---

[136]﴿یۆحەنا **14/6**تا**7**﴾

[137](یەزدان سوێندی خواردووە و بڕیاری ناگۆڕێت : هەتا هەتایە تۆ کاهینیت، بە گوێرەی ئەم سوێندەش عیسا بووە دەستەبەری پەیمانێکی باشتر. کاهینەکان زۆر بوون چونکە مەرگ بووە کۆسپ لەوەی بەردەوام بن، بەڵام چونکە عیسا هەتا هەتایە دەمێنێتەوە، کاهینێکی نەگۆڕی هەیە، لەمەوەش دەتوانیٚ ئەوانە بە تەواوی ڕزگار بکات کە لە ڕێگەی ئەوە وە دەچنە لای خودا، ئەو هەمیشە زیندووە تاکو داکۆکیان لیٚ بکات)﴿عیبرانییەکان**7/22**تا**26**﴾

ڕابگرێت.

**هاوڕێی بەبایەخم**

**من بە تەواوی هەستی هاوڕێیەتی و ڕاستگۆییەوە نزا دەکەم کە ئێوە و هەموو مرۆڤێکی تر، ئامادەبن ئەم دیاریی ڕزگاریی ئیلاهییە بەهۆی عیسای مەسیحەوە قبوڵبکەن و وەربگرن، هیچ کەسێك ناتوانێت ڕزگاری بکرێت، بەڵام خودا وەك دیاریەکی خۆڕای و موفت ئەوەی بە ئێمە بەخشیوە بە مەرجێك، ئێمە دەستی باوەڕمان بەرەو لای وی درێژبکەین و ئەو قبوڵبکەین.**

(بەشی دەیەم)

# ڕۆحی پیرۆز(روح القدس) کێیە؟

لە بیرتانە پێشتر وتم کاتێك عیسای مەسیح لە ڕێگای یەحیاوە لە ئاوهەڵدەکێشرا_تەعمید دەکرا_، ڕۆحی پیرۆز دابەزییە سەری، هەروەها پێش مەرگیش، عیسا گفتی دا کە ڕۆحی پیرۆز سوکانی دەر دەبێت بۆ شوێنکەوتوانی هەرکات بانگی لێوە کرا، یان لە شوێنێکی تر وەك باسمان کرد عیسا دەڵێت بە هاوەڵانی: ڕۆحی پیرۆز دەنێرمە لاتان تا دوای بەرزکردنەوەم بۆ ئاسمان ئەو کارانەی کە دەبێ دوای من ئەنجامی بدەن بتوانن بە باشتر و ڕێك وپێکتر بیبەنە سەر و هێزتان پێ ببەخشێت و ورەتان وەبەر بێنێت.

هەرواش بوو، دە ڕۆژ دوای بەرزکردنەوەی عیسا بۆ ئاسمان، ڕۆحی پیرۆز لە ئاسمانەوە بەرەکەتی خۆی ڕژاند بەسەر باوەڕدارانداو نێردراوان و قوتابیانی والێکرد، کە پەیامی عیسای مەسیح بە هەموو خەڵك بگەیەنن و لە ئەنجامدا چەندین هەزار نەفەر لەسەر دەستی وان باوەڕیان وە عیسای مەسیح هاورد.. باشە ئەم (ڕۆحی پیرۆز)ە کێیە؟

هەندێك وادەزانن کە ڕۆحی پیرۆز جوبرەئیل ی فریشتەیە یان پەیامهێنەر_پێغەمبەر_ێکە. هەندێکی تریش وا بیردەکەنەوە کە ڕۆحی پیرۆز شتێکی وەك (هێزێکی پیرۆزە) و لەوە زیاتر نییە، سەرەڕای هەموو ئەمانەش لە کتێبی پیرۆزدا وا تێدەگەیەنرێین کە ڕۆحی پیرۆز یەکێ نەبووە لەو شتانەی کە خودا دروستی کردبێت، بەڵکو ڕۆحی خودا خۆیەتی و لەگەڵ خودادا یەك شتە.

کاتێك لە کارەکانی ڕۆحی پیرۆز ورد دەبینەوە، ئەم بابەتەمان بە باشی بۆ ڕوون دەبێتەوە.

عیسای مەسیح فەرمووی بە پیاوێکی هزرڤان کە ناوی (نیقۆدیمۆس)بوو: ئایا دەیەوێت سەرلەنوێ لەدایك ببیتەوە تا بتوانیت برۆیتە نێو پادشاهێتی ئاسمانەوە. نیقۆدیمۆس بەسەرسوڕمانەوە پرسی کە چۆن ڕێی تێدەچێت پیاوێکی زورهان و پیری وەك ئەو بتوانێت دوو کەڕەت لە یەك ژیاندا لە دایك ببێتەوە، عیسای مەسیح وەڵامی دایەوە کە لەدایك بوونەوەی سەرلەنوێی مرۆڤ هەرمانی (ڕۆحی پیرۆزە)، ئاشکرایە کە تەنها خودای باڵادەستە دەتوانێت ژیانی ڕۆحانی بە بەشەر ببەخشێت و مرۆڤ بە ببونێکی نوێ بگۆڕێت. کاتێك کە مرۆڤ تاوان لە ژیاندا ئەنجام دەدات، ئەوا دەبێتە ڕۆڵەی شەیتان، بەڵام خودا باڵادەستە بەهۆی ڕۆحی پیرۆزی خۆیەوە دەتوانێت مرۆڤی گوناهکار بگۆڕێت و کاتێکیش کە مرۆڤ سەرلەنوێ لەدایك بوویەوە _یان نوێ بوویەوە_ ئەودەم دەبێتە ڕۆڵەی خودا.

سەرەڕای ئەمەش ڕۆحی پیرۆز نوسەر و پارێزەری کتێبی پیرۆزی خودایە، هەر ئەو بوو پەیامهێنەرانی پەیمانی کۆنی وەك داود و ئیشایای فێرکرد و بەرچاو ڕۆشنی کردن و هیدایەتی دان، هەروەها ڕۆحی پیرۆز بوو کە مەتا و لۆقا و پۆڵس و باقی نوسەرانی تری پەیمانی نوێی هیدایەتدا و یارەمەتی دان و چاودێری کردن، بەقەولی کتێبی پیرۆز:

"هەرگیز پێشبینی بە خواستی مرۆڤ نەهاتووە، بەڵکو ڕۆحی پیرۆز ڕابەرایەتی مرۆڤەکانی کردووە، بۆ ئەوەی پەیامی خودا ڕابگەیەنن"[138]

بەهەمان شێوە رۆحی خودا(واتە: ڕۆحی پیرۆز) هیدایەتی ئەوانەی داوە کە کتێبی پیرۆزیان نوسیوە و چاودێریان بووە، هەروەها ئەوانەش کە ئەو کتێبە پیرۆزەی دەخوێننەوە تاکە ڕێنمایکار و بەرچاو ڕوونکەرە بۆیان لەکاتی خوێندنەوەیدا.

عیسای مەسیح فەرمووی:

" ڕۆحی پیرۆز، یارمەتیدەرێکە، ئەوەی باوك بەناوی منەوە دەینێرێت، ئەو هەموو شتێکتان فێردەکات و هەموو ئەو شتانەی پێتانم گوتووە بیرتان دەخاتەوە"[139]

ئەڵبەتە پەیڕەوانی عیسای مەسیح هەژیو و پەرۆش بوون بۆ ئەوەی کە عیسا بەوانی وت دەبێت لەخاچ بدرێت و دوای ئەم زەوییە مادییە، بۆ جیهانێکی باڵاتر بەرز بکرێتەوە. بەڵام عیسا بە هۆی گفتی هاتنی ڕۆحی پیرۆز و ناردنی بۆلایان بۆ ئەوەی ڕێنوێن و هیدایەتدەریان بێت سوکانیی پێبەخشین و پێی ڕاگەیاندن کە خۆی هەمیشە ڕۆحییەن لە گەڵیان دەبێت و یاوەریان دەکات.

10ڕۆژ دوای بەرزکردنەوەی عیسا بۆ ئاسمان، ڕۆحی پیرۆز لە ئاسمان دابەزییە سەر پەیڕەوان و ئیمانداران و ئەوانی سەرلەنوێ دروست کردەوە و ورەی پێدان. لەوکاتەوە تا ئێستا هەمان ڕۆحی پیرۆز لەنێو ئیماندران و پەیڕەویکارانی عیسای مەسیح دا قەراری گرت و هەروەك عیسا گفتی دابوو لەنێو پەیڕەواندا مایەوە.[140]

دەبێ ئاگاداری ئەم خاڵە گرنگە بین کە تەنها ڕۆحی خودا دەتوانێت چاوی کوێری گوناهکاران بکاتەوە و ئەوان سەر لەنوێ بە بەهێزی دروستکاتەوە و وایان لێ بکات بزانن عیسای مەسیح کێیە، هەروەك کە لە کتێبی پیرۆز نوسراوە:

"هیچ کەسێك جگە لە ڕۆحی پیرۆز، ناتوانێت بڵێ عیسا پەروەردگارە"[141]

لەم ڕووەوە مایەی سەرسوڕمان نییە کە ئەوانەی ڕۆحی پیرۆز یان نییە و لە بەرەکەتی وی بێ بەشن، مەحاڵە بۆیان کە عیسای مەسیح بە(خودا) و (کوڕی خودا) ناوبهێنن.

کەواتە ڕۆحی پیرۆز لە دایکبوونەوەی نوێ بە ئیمانداران دەبەخشێت و ئاشنایی و زانینی ڕاستەقینە دەبەخشێت، تابزانین عیسا کێیە، هەروەها بەرچاوی ئێمە ڕۆشندەکاتەوە تا تاوانەکانی ناو ناخی خۆمان بزانین و وە ئێمەش بەهێز دەکات تا

---

[138]﴿دووەم پەترۆس21/1﴾

[139]﴿یۆحەنا25/14و26﴾_ئەمە بەڵێنێکی تایبەتیشە، بۆ ئەوانەی گوێیان لە وتەکانی مەسیح بووە بەهاتنی سروش بۆ نوسینەوەی ئینجیلی پیرۆز__

[140](ئەمانەم پێ گوتن کە هێشتا لەلاتانم، بەڵام یارمەتیدەرەکە، ڕۆحی پیرۆز، ئەوەی باوك بەناوی منەوە دەینێرێت، ئەو هەموو شتێکتان فێردەکات و هەموو ئەوشتانەی پێم گوتوون بیرتان دەخاتەوە، ئاشتیتان بۆ بەجێ دەهێڵم، ئاشتی خۆمتان دەدەمێ، وەك ئەوە نییە کە جیهان دەتانداتێ. نیگەران مەبن و مەترسن. گوێتان لێ بوو پێم گوتن: دەڕۆم و دێمەوە لاتان...) ﴿یۆحەنا25/14تا29﴾

[141]﴿یەکەم کۆرنسۆس3/12تا4﴾

**تۆبە بکەین و دەست لە تاوانکاری هەڵبگرین.**

**لەبەر ئەمە ئەو کەسەی کە بە عیسای مەسیح باوەڕدەهێنێت، خودا لێی خۆش دەبێت و وەك ڕۆڵەی خۆی قبوڵی دەکات و دڵێکی نوێی پێدەبەخشێت. بەڵام ئەو نەفسانەی کە ئالودەی گوناهکاری بوون و هەمیشە خەریکی تاوانکارین و دەست هەڵناگرن شەیتان هەمیشە لە ناویاندا ئامادەیە و وەسوەسە لەسەر وەسوەسەی بۆدروست دەکات تا زیاتر بەرامبەر بەوستی خودا، نافەرمانی و بێ گوێیی بکات، لێرەدا ڕۆحی پیرۆز دەتوانێت یارمەتی ئەو کەسەش بدات و وای لێبکات کە بەرگری زیاتر بکات بەرامبەر بە شەیتان، وە لەودا کاروکردەوەی وەها دێنێتە بوون کە مایەیی پەسەندی خودا بێت وەك: خۆشەویستی و پاکی و ڕاستی و دڵخۆشی و ئارامی و سەر سەلامەتی و بێوەیی...هتد.[142] ئەم کارانەی ڕۆحی پیرۆز لە نێو ئیمانداراندا تائەوکاتەی کە لەم جیهانەدا دەژین، درێژەی هەیە و پلە پلە و بە شێنەیی مرۆڤ دەگۆڕێت و بە مامۆستای خۆیان_واتە عیسای مەسیح_یان دەناسێنێت.**

**هەروەها مەبەستی خودا ئەوەیە کە ئێمە هەموومان وەك کوڕە تاقانەکەی ئەو کامڵ بین. بەڵام تەنها کاتێك وەك مەسیح کامڵ دەبین کە بڕۆینە نێو پادشاهێتی ئاسمان و بەهەشتەوە.[143]**

**ڕۆحی پیرۆز لە زۆر ڕێگای ترەوە یارمەتی ئێمە دەدات و دەست گیرۆییمان دەکات و یادمان دەهێنێتەوە کە چلۆن نزا بکەین و هەروەها ئێمە لەڕێگای خزمەت بە مەسیح یاوەری دەکات و هێزمان پێدەبەخشێت .[144]**

**ئەوەی کە لەم نموونانەوە بۆمان دەر دەکەوێت و لێی تێدەگەین ئەوەیە ڕۆحی پیرۆز لە ڕاستیدا خودی ئیلاهییە، کە لەنێو ئیمانداراندا ئادار و نیشتەجێ بووە. چ هەواڵ و ئیمتیازێکی گرانبەها و بێوێنەیە کە خودای گەورە و پیرۆز بە ڕۆحی پیرۆزی خۆی لەنێو مرۆڤدا نیشتەجێ و ئاکنجی ببێت! لە ڕاستیدا ئەمە گەورەترین خەڵاتە کە خودا دەتوانێت بە مرۆڤی ببەخشێت و ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خودا فرە بەخشندە و لێبوردەیە بەرامبەر بە مرۆڤەکان.**

**باشە ئەی ئەم خەڵاتە بە چ کەسانێك دەبەخشرێت؟**

**وەك ئاشکرایە لە زەمانی زوودا خودا ڕۆحی پیرۆزی خۆی بە پەیامهێنەران و پیرۆزان وپیاوچاکان بەخشیبوو، ئەمما کاتێك**

---

[142](بەڵام بەروبوومی ڕۆحی پیرۆز ئەمەیە: خۆشەویستی، خۆشی، ئاشتی، ئارامگرتن، نیانی، چاکە، دڵسۆزی، دڵنەرمی و بەسەرخۆدا زاڵبوون، شەریعەت نییە لەدژی ئەمانە بێت، بەڵام ئەوانەی هی عیسای مەسیحن سروشتی دنیاییان لەگەڵ حەز و ئارەزووەکانیان لەخاچ داوە، ئەگەر بە ڕۆحی پیرۆز بژین، با هەنگاوەکانی ڕۆحەکەش بپارێزین، با لەخۆبایی نەبین، یەکتری تووڕە نەکەین و لەگەڵ یەکتری چاوپیس نەبین.) ﴿گەلاتیا**4/22**تا**26**﴾

[143](خۆشەویستان ئێستا ڕۆڵەی خوداین، هێشتا دەرنەکەوتووە دەبینە چی، بەڵام دەزانین کاتێك ئەو دەردەکەوێت، ئێمە وەك ئەو دەبین، چونکە ئەو وەك خۆی دەبینین، هەرکەسێك ئەم هیوایەی بەو هەبێت، خۆی پاك دەکاتەوە هەروەك چۆن ئەو پاکە) ﴿یەکەم یۆحەنا**3/2**تا**4**﴾

[144](ڕۆحی پیرۆز لەو کاتانەی لاوازین یارمەتیمان دەدات، نازانین لەبەر چی و لەپێناو چی نوێژ و نزا بکەین، بەڵام ڕۆحی پیرۆز بەناڵەوە داکۆکیمان لێدەکات، بەشێوەیەك کەباس ناکرێت، ئەوەی دڵی مرۆڤ دەپشکنێت، دەزانێت ڕۆحی پیرۆز بایەخ بەچی دەدات، چونکە بەگوێرەی خواستی خودا داکۆکی لەگەلی پیرۆزی خودا دەکات...) ﴿ڕۆما**8/26**تا**28**﴾

بڕوانە: ﴿کردار**2/4**تا**13**﴾

**خودا کوڕی خۆی نارد تا ببێتە ڕزگاری کاری جیهان، ڕۆحی خۆشی بەهەموو ئەو کەسانە بەخشی کە بەکوڕەکەی واتە عیسای مەسیح باوەڕدەهێنن. عیسا فەرموویەتی:**

**"چ باوکێك لە ئێوە ئەگەر کوڕەکەی داوای ماسی بکات لە جیاتی ماسی ماری دەداتیٚ؟ یان داوای هێلکە بکات دوپشکی دەداتیٚ؟ جا ئێوە کە خراپن، بزانن کە دەبیٚ شتی باش بدەنە منداڵەکانتان، باوك کە لە ئاسمانە، دەبیٚ چەند زیاتر ڕۆحی پیرۆز بداتە ئەوانەی کە داوای لیٚ دەکەن..."[145]**

**خودای ئێمە باوەڕپێکراو و ئەمینە، هەرکەسێك لە هەرکاتێکدا بێت بە عیسای مەسیح باوەڕبهێنێت وە پەنا بە هەموو خراپەکارییەك بگرێت بە ئەو و وەك خوداوەندی خۆی قبوڵی بکات، وە لە خودا بخوازێت کە ڕۆحی پیرۆزی پیٚ ببەخشێت، ئەوا بێگومان خودا ئەم کارەی بۆ ئەنجام دەدات و لە پێشچاوی نشێوی و ناهەمواریيەکانیش ئاسان دەکات.**

**هەروەك چۆن کە هەموو ڕۆژێك لەبەر پێدانی ڕزق و ڕۆزی و نانی ڕۆژانە داوای لیٚ دەکەین کە پێمان ببەخشێت، ئاوهاش دەبێت بۆ درێژەدان بە ژیانی مەعنەوی خۆمان بە بەردەوامی داوای لیٚ بکەین تا ئێمە بە ڕۆحی خۆی تەژی و لێوانلێو بکات.**

**وە عیساش فەرمووی:**

**" داوا بکەن پێتان دەدرێت..."[146]**

---

[145]﴿لۆقا 11/11تا14﴾

[146](داوا بکەن پێتان دەدرێت، بگەڕێن دەدۆزنەوە، لەدەرگا بدەن لێتان دەکرێتەوە، چونکە هەرکەسێك داوابکات وەردەگیرێت، ئەوەی بگەڕێت دەدۆزێتەوە، ئەوەشی لەدەرگا دەدات لێی دەکرێتەوە) ﴿لۆقا 11/9تا11﴾

(بەشی یانزەهەم)

# سیانەك(باوك، كوڕ، ڕۆحی پیرۆز) مانای چییە؟

**هاوڕێی خۆشەویست**

ئەم پرسیارەی سەرەوە یەكێكە لەو پرسیارانەی كە زۆرترین جار ئاراستەی مەسیحیەكان كراوە، ڕاستییەكەی تێگەشتن و بەرسڤی ئەم پرسیارە هێندە ئاسان نییە، ئەمما بەپێی توانا لێرەدا وەڵامی دەدەمەوە.

ئێوە زۆر كات بیستووتانە لێرە و لەوێ كە مەسیحییەكان سێ خودا دەپەرستن: (خودای باوك) و (عیسای خودا) و (مریەمی خودا)، وە ئەم سیانەش، بە سیانەك_تپلیپ_ ناودەبرێن.

هەر بەو شێوەیەی كە لە پێشتردا ڕوونكردنەوەم دا، ئەگەر مەسیحییەكان هەر بەدیهێنراوێك بگۆڕن بە خودا یان بەناونیشانی خودا پەنای وەبەر ببەن و بیپەرستن، ئەوا بێشك مەحكومن بە ئەنجامدانی گەورەترین تاوان. مریەمی پاكیزە كەسایەتییەكی زۆر پیرۆز و موقەدەسە لامان، بەڵام ئەو هەرگیز نابێت بپەرسترێت و چونكە پەرستش تەنها بۆ خوداییە. وە بۆ عیسای مەسیحیش ڕاستە كە مەسیحیەكان ئەو پەرستش دەكەن، بەڵام ئێمە وەك پەیامهێنەرێكی پیرۆز و موقەدەس پەرستشی ناكەین، بەڵكو لەو لایەنەوە پەرستشی عیسا دەكەین كە ئەو هەر لە سەرەتا_ئەزەل_ەوە، وشە و كەلامی خودا و كوڕی خودا بووە، واتە لەگەڵ خودادا بە تەواوی یەكسانە.

عیسا كەسایەتییەك نەبوو كە ئێمەی مرۆڤ پلە و پایەی خودایەتیمان پێ بەخشیبێت یان یەكسانمان كردبێت لەگەڵ خودای باوك، بەڵكو لە ڕاستیدا ئەو هەر لە ئەزەلەوە لەگەڵ خودادا یەكێك بووە و هەر لەبەر ئەمەش بوو، بوویە مرۆڤ بۆ ئەوەی ئێمە لە گوناهەكانمان ڕزگاركات و بەرەو لای خودا بمانگێڕێتەوە، لەم ڕووەوە ئەو شایستەی ئەوەیە پەرستش بكرێت چوون ئەو بەڕاستی خودایە.

سەرەڕای ئەمە پێشتر ڕوونم كردەوە كە ڕۆحی پیرۆز_ڕۆحی خودا_ یەكێك نییە لەدروستكراوەكانی خودا، بەڵكو یەك شتە لەگەڵ خودادا و خودی خودایە، ڕۆحی پیرۆز لە ژیانی مرۆڤدا هەر ئەو كارە ئەنجام دەدات كە تەنها خودایی باڵادەست و بەتوانا دەتوانێت ئەنجامی بدات، هەر لەبەر ئەمەشە شایستەی پەرستش دەبێت هەروەك چۆن كوڕەكەی شایستەی پەرستش و ستایشە.

ئەنجام چییە؟ ئایا مەبەست لەم قسانە ئەوەیە كە سێ خودا بوونی هەیە (باوك و كوڕ و ڕۆحی پیرۆز)؟

بێ شك نەخێر! مەبەست لەم قسانە ئەوە نییە، دووبارەی دەكەمەوە، خودا تاك و تەنها و بەرهەقە وە بۆ هەمیشەش هەروا دەمێنێتەوە، بەڵام هەر لە ئەزەلەوە خودای تاك و تەنها هەڵگری سێ خەسڵەت بووە كە (باوك و كوڕ و ڕۆحی پیرۆز)ە.

باوك، هەرگیز بەچاوی سەری مرۆڤەكان نابینرێت و سەرچاوە و بناوانی ئیلاهییە، یەك جار لە مێژووی بەشەردا كوڕ_

**واتە:عیسای مەسیح_ ، باوکی نەبینراو_واتە:خوداوەندی ئەزەل و ئەبەد_ی بەشێوەیەکی تەواو ئاشکرا نیشان دا. ڕۆحی پیرۆز بەهۆی باوك و کوڕەوە بەخشرا تا ئیرادە و ویستی خودا لەنێو خەڵکدا پراکتیکە بکات، کەواتە دۆستی بەقەدرم، دڵنیابن کە مەسیحییەکان خودای تاك و تەنها(کە هەر سێ جەمسەری باوك و کوڕ و ڕۆحیی پیرۆز)ە، پەرستش دەکەن، وە عیساش بە ئەم تاك پەرستییە لە سیانەکدا ئاماژەی کردووە، بە نێردراوانی خۆی فەرمانی داوە کە بۆ هەموو شوێنێك بڕۆن و خەڵکی بە ئەو ئاشنا بکەن و باوەڕداران بەناوی(باوك و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز) لەئاوهەڵبکێشن.[147] لە بەشەکانی دواتریشدا زیاتر لەسەر لەئاوهەڵکێشان_تەعمید_ قسان دەکەین.**

[147](کەواتە بڕۆن، هەموو گەلان بکەن بە قوتابی، بەناوی باوك و ڕۆڵە و ڕۆحی پیرۆز لەئاویان هەڵکێشن، فێریان بکەن با کاربکەن بە هەموو ئەوشتانەی ڕامسپاردوون، ئەوەتا هەموو ڕۆژێك لەگەڵتانم هەتا کۆتایی زەمان.) ﴿مەتا**28/19**و**20**﴾

(بەشی دوانزەهەم)

# کـڵێسا چییە؟

لەوانەیە بیستبێتتان کە خەڵکی ئەو بینایانەی مەسیحییەکان پەرستشی تێدا ئەنجام دەدەن بە (کڵێسا) ناو دێنن، هەرچەندە خەڵکی بەگشتی ئەو بینایانە بەکڵێسا دەزانن بەڵام مانای ڕاستەقینەی(کڵێسا) لای ئێمە بینایەکی جوان و لەو شێوەیە نییە، بەڵکی مەبەست لە کۆبوونەوەی ئەو ئیماندارانەیە کە لەنێویدا پەرستش ئەنجام دەدەن، یان کۆبوونەوەی چەند ئیماندارێك پێکەوە لەشوێنێکدا گەر کڵێساش نەبێت لای ئێمە وەك کڵێسایەکە، کڵێسا ئاماژەیە بە کۆمەڵەی ئیماندارانی مەسیح لە سنورێکی تایبەت و دیاری کراودا، کڵێسا بۆ تەواوی باوەڕداران_هەم ئەو ئیماندارانەی کە هێشتا لەم جیهانەدان و کۆدەبنەوە لە دەوری یەکتر و هەم بۆ ئەو کەسانەی لەگەڵ مەسیح لە ئاسمانن_بەکار دەبرێت.

لە زەمانی ڕابردوودا خودا ڕۆڵەکانی ئیسرائیلی هەڵبژارد تا گەلی دانەبڕێری ئەو بن، وە فەرمانەکانی خۆی بەهۆی موسای پەیامهێنەرەوە نارد بۆیان، هەروەها سەرزەمینی فەلەستینی پێدان و چەندین پەیامهێنی هەنارد تا فێریان بکات و سەبارەت بە هاتنی (مەسیحی وادەدراو) قسەیان بۆ بکات و ئاگاداریان کاتەوە. کاتەك کە عیسای مەسیح_واتە:مەسیحی وادەدراو/موعود_ لە زەمانی دیاری کراوی خۆی لەنێو ئیسرائیلیاندا دەرکەوت، هەندەك لە خەڵکی باوەڕیان پیٚ هێنا، بەڵام زۆربەیان باوەڕیان پیٚ نەکرد.

ئینجا خودا ئەوانەی کە باوەڕیان بە مەسیح هێنا، گەل و کۆمەڵێکی نوێی لیٚ سازاندن کە بە (کڵێسای مەسیح) ناودەبرێت، لە سەرەتاوە تەنها ئیسرائیلییەکان بە گەلی هەڵبژاردەی خودا هەژماردەکران، بەڵام لە دوایدا و تا ئێستا هەموو ئەو ژن و پیاوانەی کە سەر بە نەژاد و میلەتی جۆراوجۆرن لەسەر زەوی و بە عیسای مەسیح باوەڕدەهێنن، بە گەلی نوێی خودا هەژماردەکرێن.

ڕێگای چوونە ناو ئاین و کۆمەڵەی یەهودیان بە دەستپێکردنی مەراسیمی(خەتەنەکردن)نە، کە خودا بۆ ئیبراهیم و هەموو بنەچەی گوێڕایەڵی ئەو، فەرمانی لەسەر دەرکرد ئەنجام بدرێت، بەڵام ڕێگای سەرەتای چوونە نێو کڵێسای مەسیح، کە گەلی نوێی خودان، بە (لەئاو هەڵکێشان) دەست پێدەکات، هەر لەبەر ئەمەشە بۆ گەلی نوێی خودا خەتەنەکردن هیچ گرنگییەکی ئاینی نییە.

لەئاوهەڵکێشان هەروەك مەسیح داوای کربوو، لەسەر کەسانێك ئەنجام دەدرێت کە تۆبەیان کردووە و باوەڕیان بە عیسای مەسیح هێناوە، ئەم لەئاو هەڵکێشانە ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەمانە ئیتر ئەندامن لە خێزانی ڕۆحانی خودا.

لە ئاوهەڵکێشان خۆی، کەس ڕزگار ناکات، ئەوەی گوناهکاران بە پلەی یەکەم ڕزگار دەکات، باوەڕهێنانە بە عیسای مەسیح.

**لـه ئاوهەڵکێشان نیشانه و سیمبولی پاکبوونەوەیە لـه گوناهەکان، دەستپێکی ژیانێکی نوێیه لـه سایەی عیسای مەسیحەوە، لـه هەندێك کڵێسادا لـەئاوهەڵکێشان، بەشێوەی پرژاندنە بەسەری تۆبەکارەکەدا یان بە جامێکە ئاوەکە دەکەن پێیدا، بەڵام هەندەك کڵێسای تر کەسەکە بە تەواوی نوقمی ئاو دەکەن و دەریدەهێننەوە، لـەئاوهەڵکێشان لـه ژیاندا تەنها یەك جار لـەسەر کەسێك ئەنجام دەدرێت.**

**لـه پەیمانی نوێدا کڵێسا بە ( لاشەی عیسا) ناودەبرێت، واتە بەو مانایەی کە مەسیح سەری ئەو لاشەیەی کڵێسایە، و تەواوی ئەندامەکانی ئەو لاشەیەی عیسا لـەهەر نەژاد و زمان و ڕەنگێك، لـەناو ئەودا دەبن بەیەك و وەك یەك گرنگن، واتە هیچ ئەندامێکی لـەش نییە بوونی گرنگ نەبێت، کڵێسا یەکە هەروەك چۆن مەسیح یەکە، هەروەها کڵێسا پیرۆزە، لـەبەر ئەوەی پەیوەندیدارە بە خودای پیرۆزەوە، سەرەڕای ئەم پیرۆزی و مەقامە بەرزانە کە بۆ کڵێسا هەیە، ئەمڕۆکە دەبینین کڵێسا دووچاری تەفرەقە و لـەیەك دوورکەوتنەوە بووە، هەندێ کات لـه نێوانیاندا گوناهکاری و ڕق و دووبەرەکی بوونی هەیە، بۆچی بەم شێوەیەیە؟!**

**خاڵی یەکەم کە دەبێ سەرنجی بخەینە سەر ئەوەیە: لـەناو کڵێسادا هەندێك کەس هەن بەهۆی ڕۆحی پیرۆزەوە لـه دایك نەبوونەتەوە و هەر ئەم هۆکارەش وای کردووە بەڕاستی مەسیحییەکی باش نەبن، یان هەر شایەنی ئەوە نەبن بە مەسیحی ناوزەند بکرێن، لـه کتێبی پیرۆزدا نوسراوە کە هەرکەسێك ڕۆحی مەسیحی نەبێت، ئەوا نابێتە ئەندامێك لـه ئەو.[148]**

**دەبێ ئەوە بزانین هەموو ئەندامەکانی کڵێسا هاوشێوەی نەخۆشێکن کە بۆ شیفا وەرگرتن هاتوونەتە نەخۆشخانەیەکەوە، وە خۆیان بە دەستی پزیشکێکی گەورە دەسپێرن کە عیسای مەسیحە و ئەویش ئەوان بە شێنەی و هەنگاو بە هەنگاو چارەسەریان دەکات و لـه نەخۆشی گوناه و تاوان ڕزگاریان دەکات.**

**هەروەها تا ئەو کاتەی کە مەسیحییەکان لـەم جیهانەدا دەبن، لـه ئاکامەکانی گوناه بە تەواوی ڕزگاریان نەبووە، جا هەر لـەبەر ئەمەشە هەموومان پێویستمانە گوناهەکانی خۆمان دان پێدا بنێین و تۆبەیان لێ بکەین.**

**هەموو جۆرێك لـه بەشەر گوناهکارە و تاوانبارە، بەڵام جیاوازییەك کە لـه نێوان مەسیحیەکان و کۆمەڵانی تردا هەیە ئەوەیە کە مەسیحییەکان بەڕاستی خۆیان بە پزیشکێك دەسپێرن کە خودا ناردوویەتی و چارەسەر و دەوای ئەو کەڵك لێ وەردەگرن و فەرمایشتەکانی ئەو بەجێ دەگەیەنن، لـه کاتێکدا کە غەیرە مەسیحییەکان ئەمە ناکەن.**

**هەموو ئیماندارانی ڕاستەقینە لـەناو مەسیحدا یەکێکن، لـەوانەیە ئاگاداربن کە لـه جیهاندا دەستە و ڕێڕەوی مەسیحی جیاواز لـەیەك بوونیان هەیە، بۆنمونە ئەو دوو ڕێڕەوەی کە زۆرترینی مەسیحییەکان پێك دەهێنن و شوێنکەوتوویان زۆرە (کاتۆلیك) و (پرۆتستانت)ە، ئەم دوو ڕێڕەوە گەورەیەی ناو مەسیحیەت جیاوازیان لـه هەندێك شتدا هەیە لـەگەڵ یەکتر،**

---

[148](بەڵام ئێوە، ئەگەر ڕۆحی خودا لەناوتاندا نیشتەجێ بێت، ئەوا لەژێر کاریگەری سروشتی دنیایی نین، بەڵکو لەژێر کاریگەری ڕۆحدان، ئەگەر یەکێکیش ڕۆحی مەسیحی نەبێت، ئەوا لەو نییە و هی مەسیح نییە.) ﴿ڕۆما**8/9**تا**11**﴾

بەڵام ئەوەی جێگیرە ئەوەیە کە کتێبی پیرۆزی ئەم دوانە و تەواوی مەسیحیانی تریش هەر یەك کتێبە، بێ جیاوازی و دەستکاری.

کاتۆلیکەکان و پرۆتستانتەکان بە نموونە هەردوولایان باوەڕیان بەوە هەیە کە عیسای مەسیح کوڕی خودایە و باوەڕیان بەوە هەیە کە عیسا لەسەر خاچ گیانی لەدەستدا و دواتر زیندوو بوویەوە، وە هەردوولا باوەڕیان وایە کە تاکە ڕزگاریکار و خوداوەندە.

ئەگەرچی مەسیحییەکان لە ڕووی هەندێك بابەتەوە_تەنانەت بابەتە بنچینەییەکانیش_ جیاوازیان هەیە، بەڵام بە گشتی باوەڕیان بە یەکێتی لە نێوان هەموو ڕێڕەوەکان هەیە و خوازیارن هەروەك مەسیح لێیانی دەخوازێت لەخۆشەویستی و ئیماندا ببنە یەك پارچە.

ئامانجی کڵێسا چییە؟

یەکێ لەئامانجەکانی کڵێسا ئەوەیە کەسانی ئیماندار بەهێز بکات و فێریان بکات، وە یارمەتیان بدات تا زیاتر خودا بناسن و برەو بە باوەڕیان بدات و گۆشیان بکات لەسەر خۆشەویستی، هەروەها ڕایان بهێنێت لەگەڵ ئیماندارانی تردا دۆستایەتی بتەوتر بکەن و ئاموشۆی یەکتری بکەن. زۆر گرنگە هەر ئیماندارێك فەرمانی مەسیح لەبارەی لەئاوهەڵکێشان و ئەندام بوون جێبەجێ بکات، هەر مەسیحییەك بە مەسیحییەکی تر نیازمەندە، هەروەك ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ کە بە هەموو ئەندامەکانی تری جەستە پێویستی و وابەستەی هەیە، هەرگیز نابێت هیچ ئیماندارێکی مەسیحی خۆی لە هاوڕێیەتی و وابەستەی کەسانی ئیمانداری دیکەی کڵێسا جیابکاتەوە. عیسای مەسیح کڵێسای بە پاکی دروستکردووە و کاری ئەوی لەم جیهانەدا بە ئەنجام گەیاند.

کاتێك کە عیسا وەك مرۆڤێك لەم جیهانەدا ژیانی بەسەردەبرد، وشەکانی خودای بۆ خەڵکی بەیان دەکرد، نەخۆشەکانی شیفا دەدا، غەمبارەکانی دڵشاد دەکرد، سوکنای بە دڵ و دەرونیان دەبەخشی و گوناهکارانی لە گوناه ڕزگار دەکرد. عیسای مەسیح پێش ئەوەی بەرزبکرێتەوە بۆ ئاسمان، فەرمانی دا بە پەیڕەوانی خۆی، کە مزگێنی ڕزگاری بە هەموو خەڵکی جیهان بگەیەنن. گرنگترین کار و ئەرکی مەسیحییەکان لە هەموو کیشوەرەکانی جیهان ئەوەیە کە مزگێنیەکەی وی بە گشت خەڵکی بگەیەنن کە دەیان بینن، ڕێنوێنی خەڵك بکەن بۆ ئەوەی باوەڕ بەو بهێنن. هەروەها دەبێت مەسیحییەکان خۆشەویستی مەسیح بە هەموو نەژاد و مەزهەبەکان، بەهۆی شیفا دانی نەخۆشان و دەرز دادانی جاهیلان و خواردن پێدانی برسیان و وتاری ئاینی بۆ ڕزگاری دیلەکانی گوناه، نیشان بدەن.

عیسای مەسیح ژیانی خۆی لە خزمەتی خەڵکدا سەرف کرد و ئەندامەکانی کڵێسای ئەو دەبێ ئەو بکەنە سەرمەشقی خۆیان.

وەك چۆن مێگەلێك پێویستی بەوەیە شوانێك چاودێری بکات و بیپارێزێت، ئاوهاش هەر کۆمەڵە ئیماندارێك پێویستی بە

ڕابەرێك هەیە تا فێریان بکات و ڕێنماییان بکات و ئافەرینی بکات بۆکاری باش و چاودێریان بێت، لە کاتی پێویستدا ئەوانەی کە لادەدەن بیانگێڕێتەوە و یارمەتیان بدات.

هەر لە سەرەتای دروست بوونی کلێساوە، خودا بەم شێوەیە ڕابەرانی بۆ ڕۆڵەکانی خۆی لە کلێسادا بەرهەڤ کرد، عیسای مەسیح دوانزە کەسی هەڵبژارد کە ببنە نێردراوی خۆی و پەیامی وی بە هەموو خەڵکی جیهان بگەیەنن و کلێسای ئەو بسازێنن، ئینجا بەو شێوەیەی کە لە پەیمانی نوێدا دەیبینین، خودا هەندێکی تری هەڵبژارد کە لە کلێسا شڤان و مامۆستا و مزگێنی دەر و خزمەتکار و ڕابەر و سەرپەرشت بن، هەموو ئەم خزمەتکارە ڕۆحانیانەی مەسیح لە کلێسادا ئەرکی خۆیان هەتا ئەمڕۆ بە ئەنجام دەگەیەنن.

**(بەشی سیانزدەهەم)**

# مەڕاسیم و ئەرکە ئاینییەکانی مەسیحیەت کامانەن؟

**لەبەر ئەوەی کارو ڕەوتی پەرستنی مەسیحییەکان، لەچەند ڕوویەکەوە لەگەڵ پەرستشی پەیڕەوانی دیکەی مەزهەبەکانی تردا جیاوازی هەیە، هەندێ کات بە هەڵە تێگەشتن ڕووی داوە و وتراوە کە مەسیحییەکان ئەرك و ڕێوڕەسمی ئاینیان نییە. لە هەمان کاتدا دەمەوێت ئەم بابەتە بە تەواوی ڕۆشن کەمەوە کە مەبەستی پەرستشی مەسیحییەکان بۆ ڕزگاری و لێخۆش بوون بەدەست هێنان لە گوناهەکان نییە، بەو شێوەیەی کە پێشتریش هەندێ ڕوونکردنەوەم لەو بارەوە دا، ڕزگاری بەدەست هێنان ناتوانین بەهۆی ئەو کارانەی کە ئەنجامی دەدەین بەدەست بهێنین، بەڵکو ئەم بەخششە لەلایەن خوداوە بەشێوەی خۆڕایی بە ئێمە دەبەخشرێت بەمەرجێك بە عیسای مەسیح باوەڕبهێنین، لەم ڕەوەوە ئێمە خودا دەپەرستین نەك لەڕووی ئەوەی کە ڕزگاری بەدەست بێنین بەڵکو بەنیازی هامرازی خۆشەویستی و پێزانین لە هەمبەر خودا بۆ ڕزگاری هەروایی و خۆڕایی کە خودا بەخشیویەتی.**

**مۆڵەتم بدە هەندێك پەرستشی مەسیحیان بەشێوەیەکی کورت و پوخت بۆ ئێوە باس بکەم:**

**یەکەم: نزا**

**عیسای مەسیح فەرمانی بە شوێنکەوتوانی خۆی نەداوە کە ناچارbن هەموو ڕۆژێك لە کاتێکی تایبەت و دیاریکراودا، نزا بە زمانی عیبری یان یۆنانی دووبارە بکەنەوە. بە پێچەوانەوە بەوانی فەرمووە کە هەروەك چۆن ڕۆڵەکان لەهەر کات و شوێنێکدا بیانەوێت بۆ لای باوکی خۆیان دەڕۆن و لەگەڵی قسە دەکەن، ئاوها ئەوانیش هەرکات ویستیان وەك ڕۆڵە و منداڵ بچنە حزوری خودا و بەزمانی ئەسڵی و دایکی خۆیان لەگەڵی قسەبکەن. شێوازی نزاکردن گرنگییەکی زۆری نییە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە زۆر بە هاودڵی و هەڤرەنگی و بە هەموو فکر و دڵ خۆمان پەرستشی بکەین.[149] مەسیحییەکان، کاتێك کە لەگەڵ یەکتریدا لە بینای کلێسای خۆیان کۆدەبنەوە نزا دەکەن.**

---

[149]-(کاتێك نوێژ دەکەن وەك دووڕوان مەبن، ئەوان حەز دەکەن بەپێوە لە کەنیشت و سوچی شەقامەکان نوێژبکەن، تاکوو بۆ خەڵك دیار بن. ڕاستیتان پێ دەڵێم: ئەوانە پاداشتی خۆیان وەرگرتووە. بەڵام تۆ کاتێك نوێژ دەکەیت، بڕۆ ژوورەکەت و دەرگا لەسەر خۆت داخە، نوێژبکە بۆ باوکی نەبینراوت، باوکیشت ئەوکارانە دەبینێت کە بەنهێنی ئەنجام دراوە، پاداشتت دەداتەوە. کاتێك نوێژ دەکەن وەك بت پەرستان ئەوەنە وشەکان دووبارە مەکەنەوە، چونکە وادەزانن بەو زۆر گوتنە گوێیان لێدەگیرێت، لەبەر ئەوە وەك ئەوان مەبن، چونکی باوکتان دەزانێ پێویستتان بە چییە، پێش ئەوەی داوای لێ بکەن، بەڵام ئێوە بەم شێوەیە نوێژبکەن: ئەی باوکمان لە ئاسمان، با ناوت پیرۆز بێت، با پادشایەکەت بێت، با خواستت لەسەر زەوی پەیڕەو بکرێت وەك لە ئاسمان، نانی ڕۆژانەشمان ئەمڕۆ بدەرێ، لە گوناهەکانمان خۆش بە، هەروەك ئێمەش لەوانە خۆشدەبین کە خراپەمان بەرامبەر دەکەن، مەمانخەرە تاقیکردنەوە بەڵکو لە شەیتان ڕزگارمان بکە.. ئەگەر گەردنی خەڵکی لەبەر خراپەکانیان ئازاد بکەن، ئەوا باوکی ئاسمانیشتان لێتان خۆش دەبێت، بەڵام ئەگەر گەردنی خەڵکی ئازاد نەکەنن ئەوا باوکیشتان لە گوناهەکانتان خۆش نابێت.)
﴿مەتا**5/5**تا**15**﴾

- (خوداپەرستە ڕاستەقینەکان، بە ڕۆحی پیرۆز و ڕاستی خودا دەپەرستن، چونکە باوك داوای ئەم جۆرە خواپەرستانە دەکات، خودا ڕۆحە و پێویستە ئەوانەی دەیپەرستن بە ڕۆحی پیرۆز و ڕاستی بیپەرستن.) ﴿یۆحەنا**23/4**تا**25**﴾

**هەروەها لـەگەڵ خێزانی خۆیان لـەماڵـەوە یان کاتێك سەرقاڵی کاری ڕۆژانەی خۆیانن لـە بێدەنگیدا نزا دەکەن، زۆرێك لـە مەسیحییەکان وا ڕاهاتوون هەموو ڕۆژێك (بە شێوەیەکی تەنها) بەشێك لـە کتێبی پیرۆز بخوێننەوە و نزا بکەن، ئەوان لـە دوعاکانیاندا خودا بۆ هەموو بەخشش و نیعمەتە زۆرەکانی سپاس دەکەن، دان بە تاوانەکانی خۆیاندا دەنێن و داوای لێخۆش بوون دەکەن، بۆ شیفای نەخۆشەکانیان و ڕزگارکردنی کەسە بێ ئیمانەکانیان یان هەر بێ ئیمانێکی تر نزادەکەن، هەروەها بۆ سەرکردە و فەرمانڕەواکانی خۆیان و بۆ ئاشتی و پێکەوە ژیانی جیهان نزا دەکەن، عیساش فەرمویەتی کە ئێمە دەبێت هەمیشە نزابکەین.**[150]

**لـەبەر ئەوەی عیسای مەسیح لـە ڕۆژی (یەك شەممەدا) لـەنێو مردووان هەستایەوە، ڕۆژی یەك شەممان بۆ مەسیحییەکان ڕۆژێکی پیرۆزە و پەرستش و ڕسومی نوێژ و نزا خوێندنیش بە گشتی لـە کلێساکاندا لـەو ڕۆژەدا ئەنجام دەدرێت، بەڵام لـە ڕۆژەکانی تردا هەندێك دانیشتن و پەرستشی تریش بوونیان هەیە.**

**وە ئەگەر ئێوەش دەتانەوێت خۆتان ببینن و بەژداری بکەن لـە دانیشتن و کۆبوونەوەیەکی مەسیحییەکاندا بۆ عیبادەتکردن، دڵنیام داوابکەن لـە هاوڕێیەکی مەسیحیتان ئێوە دەبات لـەگەڵ خۆی و نیشانتان دەدات چۆن بەڕێوە دەچێت ڕسوومی مەسیحییەکان.**

**دووەم: ڕۆژوو**

**عیسای مەسیح بۆ پەیڕەوانی خۆی، ڕۆژ و کاتێکی دیاریکراوی بە تایبەتی دیاری نەکردووە بۆ ڕۆژووگرتن تێیدا، هەر بەم بۆنەیەوە ڕۆژووگرتن بۆ پەیڕەوانی مەسیح بە دەستەخۆ و ئیختیارییە. سەرەڕای ئەمەش بە پەیڕەوانی خۆی فەرموو هەرکاتێك بە ڕۆژوو دەبن، دەبێ تەنها لـەبەر خاتری خودا بەڕۆژووبن و ڕوویان تاڵ نەکەن نەك وەك ڕیاکاران ڕۆژوو بگرن بۆ ئەوەی خەڵك پێیاندا هەڵبدات .**[151]

**هەندێك لـە مەسیحییەکان لـە ڕۆژی هەینیدا بە بۆنەی ئەو ڕۆژەی کە عیسای مەسیح لـەخاچ درا خۆیان دەپارێزن لـە زۆر کار و کردەوە و خۆشیان دەگرنەوە لـە هەندێ خۆراك یان هەموو خۆراکێك بە بۆنەی ئەو ڕۆژەوە، هەندێکی تر بۆماوەی 40ڕۆژ پێش هەستانەوەی مەسیح لـە خواردنی هەندێك خواردن خۆیان دەگرنەوە و دەست هەڵدەگرن، لـەبارەی ئەم ڕێوڕەسم و عیبادەتانەوە لـە کتێبی پیرۆزدا فەرمانێك یان دەستورێك نادۆزینەوە، بەڵکو تەنها دەستور دراوە کە لـە ئەنجامدان و گوتنی هەموو ئەوشتانەی کە گوناهـ ئامێزن خۆپارێزی بکرێت، زۆر گونجاوە، لـەم بارەوە گوفتارێکی**

---

[150](پێویستە هەمیشە نوێژبکەن و وڕە بەرنەدەن...) ﴿لۆقا**18/1**تا**2**﴾

[151](کاتێك بەڕۆژوو دەبن، ڕووگرژ مەبن وەك دووڕووان، چونکە ڕوویان دەگۆڕن تاکو بۆخەڵکی دەربخەن کە بەڕۆژوون، ڕاستیتان پێدەڵێم ئەوانە پاداشتی خۆیان وەرگرتووە، بەڵام تۆکە بەڕۆژوو دەبیت، سەرت چەوربکە و دەموو چاوت بشۆ، بۆئەوەی خەڵك پێت نەزانێ کە بەڕۆژوویت، تەنها باوکی نەبینراوت نەبێت، باوکیشت ئەو کارە دەبینێت کە بە نهێنی ئەنجام دراوە، پاداشتت دەداتەوە.) ﴿مەتا**6/16**تا**19**﴾

**مەسیحتان وەبیر بهێنمەوە کە فەرمووی هەموو خۆراکێك پاك و حەڵاڵە و ئەوەی مرۆڤ پیس و ناپاك دەکات خۆراکێك نییە کە لەدەرەوەی مرۆڤەوە دێتە ناویەوە بەڵکو هۆکاری ناپاك بوونی مرۆڤ ئەو گوناهانەیە کە لەدڵەوە و لەناوەوە دەردەچن.**[152]

**سێیەم: خێر و چاکەکردن(صدقە)**

**عیسای مەسیح دیاری نەکردووە چەندێك و بڕی چەند لە دەرامەت و سامانی مەسیحییان دەبێت بۆ کاری خودا پەسەند و هاوکاری بە هەژاران ببەخشرێت، بەڵام فێری کردووین کە هەموو سامانی خۆمان موڵکی خودایە و ئێمە دەبێ بەپێی توانا، کەم و زۆر لەژێر ڕۆشنای ڕێنماییەکانیدا سوود لەو دەرامەتەمان ببەین و دەستگیرۆی کەسانی دەست کورتی پێ بکەین، کەوابوو مەسیحیەکان بە مەبەستی دەربڕین و دەرخستنی حەق ناسی بەرامبەر بە خودا لەو شتەی کە بەشێوەی ئەمانەت بە ئەوان سپێردراوە بە خواست و دڵی خۆیان وەك دیاری پێشکەش دەکەن، تا پشتیوانی شوانان و ئەنجامی خواستەکانی کلێسا و هاوکاری بە هەژاران و دەستکورتان و نەخۆشان و بۆ گەیاندنی مزگێنی ڕزگاری مەسیح بە کەسانێك کە ناوی ئەویان نەبیستووە و نەیان ناسیوە سوود لە پارە و هاوکاریەکە ببەن.**

**مەسیح فەرمووی کە پەیڕەوانی دەبێت بە دڵاڤایی و بەخشندەییەوە دیاری ببەخشن تا خودا خۆشحاڵ بێت و لە خۆیانی ڕازی بکەن و هەر لەبەر ئەمەشە کە زۆرێك لە مەسیحییەکان خێرات دەکەن بە دیاریکردنێك بۆ خۆیان، بۆ نموونە دە دیناریان هەبێت دینارێکی یان پێنج دیناری ...هتد ئیتر بەپێی خواستی کەسەکە خۆی دەبەخشن، بەڵام بە گشتی هەر خێرێك دەکەن لەبەر ئەوە نایکەن کە چاوەڕێی دەست خۆشی لە خەڵك بن و بۆ بەرچاوی خەڵك بێت، چوون عیسا ڕێگری کردووە لەوە .**[153]

**چوارەم: دیەنی و زیارەت**

**عیسای مەسیح بە هیچ شێوەیەك بە پەیڕەوانی خۆی نەفەرمووە کە بۆ فلانە شوێنی پیرۆز بە مەبەستی دیەنی و زیارەت بڕۆن، چونکی خودا لە هەموو شوێنێکدا بوونی هەیە و ئامادەیە، هەرکەسێك بیەوێت دەتوانێت ئەو لە هەرکوێیەك بێت،**

---

[152](هەرچی لە دەرەوەی مرۆڤەوە دێتە ناویەوە ناتوانێت گڵاوی بکات، چونکە ناچێتە دڵییەوە، بەڵکو سکی، دەچێتە دەرەوە بۆ ئاودەست، بەمەش ڕایەگەیاند کە هەموو خواردنێك پاکە، ئینجا فەرمووی: ئەوەی لە مرۆڤ دەردەچێت ئەوەیە مرۆڤ گڵاو دەکات، چونکە لە ناوەوە، لە دڵی مرۆڤەوە، بیری خراپ دەردەچێت: بەدڕەوشتی، دزی، کوشتن، داوێنپیسی، چاوچنۆکی، خراپەکاری، هەڵخەڵەتاندن، بەرەڵایی، چاوپیسی، کفر، لوتبەرزی، گێلی... هەموو ئەم خراپانە لە ناخی مرۆڤەوە دەردەچن و گڵاوی دەکەن.) ﴿مەرقۆس**7/18**تا**24**﴾

[153]( هۆشیاربن نەکەن لەبەرچاوی خەڵك چاکە بکەن، بۆئەوەی بتانبینن، ئەگینا لەلای باوکی ئاسمانیتان پاداشتتان نابێت، لەبەر ئەوە کاتێك خێردەکەیت، لە پێش خۆت زۆڕنا لێمەدە وەك دووڕوان کە لە کەنیشت و سەرشەقامەکان دەیکەن، تاکو لەلایەن خەڵك ستایش بکرێن، ڕاستیتان پێدەڵێم: ئەوانە پاداشتی خۆیان وەرگرتووە، بەڵام تۆ کە خێرێك دەکەیت، مەهێڵە دەستی چەپت بزانێت دەستی ڕاستت چی دەکات، تاکو خێرەکەت بە نهێنی بێت، باوکیشت ئەوکارە دەبینێت کە بەنهێنی ئەنجام دراوە، پاداشتت دەداتەوە.) ﴿مەتا**6/1**تا**5**﴾

**پەرستش بکات، هەندێك لە مەسیحییەکان پێیان خۆشە بڕۆنە (فەڵەستین) و ئەو سەرزەمینەی کە عیسای مەسیح تێیدا ژیانی بردە سەر ببینن، بەڵام ڕۆشتن بۆ ئەو شوێنە بە هیچ شێوەیەك فەرمانێکی بنچینەی ئاینی نییە.**

**رێ تێنەچووە بتوانین بە ڕۆشتن بۆسەر گۆڕی مەسیح، ڕێزی خۆمان نیشانی لاشەی ئەو بدەین، چوون گۆڕەکەی خاڵییە و ئەو زیندووە هەنوکە.**

**پێنجەم: جەژنەکان**

**عیسا نەیفەرمووە بە پەیڕەوانی خۆی کە فڵانە ڕۆژ بە تایبەتی جەژن بگێڕن، بەڵام مەسیحییەکان سێ جەژنی گرنگ ئەگێڕن:**

**یەکەم جەژن جێژنی لەدایك بوونی مەسیحە، زۆربەی مەسیحییەکان لەدایك بوونی مەسیح لە ڕۆژی بیست و پێنجەمی مانگی دوانزە دادەنێن و هەموو ساڵێك لەو کاتەدا جەژن دەگێڕن، بەڵام هەندێکی تر لە مەسیحییەکان ئەم جەژنە لە 6ی کانونی دووەم دەگێڕن، ئەوەی ڕاستییە ڕۆژی لەدایك بوونی عیسای مەسیحی بەڕێکی نازانرێت.**

**دووەمین جەژنیش، جەژنی(هەستانەوە)یە، واتە ئەو ڕۆژەی کە مەسیحییان بە بۆنەی سەرکەوتنی مەسیح بەسەر مەرگ و هەستانەوەی لەنێو مردوان جەژن و شادی دەگێڕن. مێژوو و کاتی هەستانەوەی عیسای مەسیح لەبەر ئەوەی لەسەر ڕۆژمێری مانگییە، هەموو ساڵێك گۆڕانکاری بەسەردا دێت، بەڵام هەمیشە لە مانگەکانی ئازار و نیسانە، سێیەمین جەژن بریتییە لە جەژنی (پنتیکاست/پێنجانە) کە هاوکاتە لەگەڵ حەوت هەفتە دوای جەژنی (هەستانەوە) و یادگاری ڕۆژێکە کە ڕۆحی پیرۆز دابەزییە سەر نێردراوان و قوتابیانی مەسیح دوای خۆی. ئەم سێ جەژنە بریتین لە جەژنەکانی ئاینی مەسیح، سەبارەت بە جەژنی سەری ساڵیش ئەوە جەژنی میللەتانە نەك جەژنێکی مەسیحی.**

## شەشەم: مەراسیمە گرنگ و پیرۆزەکان

**عیسای مەسیح فەرمانی بە ئەنجامدانی دوو مەراسیم کردووە کە دەبێت لە کڵێسای ئەو لەبەرچاو بگیرێت بە ڕێکی جێبەجێبکرێت، یەکەم مەراسیم لەئاوهەڵکێشانە کە پێشتر لەم بارەوە قسەم کرد، ئەم مەراسیمە پیرۆزە لە کاتی بە ئەندامبوونی تاکەکاندا لە کڵێسا ئەنجامدەدرێت، دووەم مەراسیم بریتییە لە (شێوی پیرۆز یان کۆتایی/عشا مقدس).**

**عیسای مەسیح ئەو شەوەی پێش ئەوەی لە خاچ بدرێت، نانی دا بە قوتابییە هەڵبژێردراوەکانی خۆی و پێی فەرموون:**

**" ئەمە جەستەی منە"**[154]

**هەروەها پیاڵەیەك شەرابی پێدان و فەرمووی:**

---

[154](ئەمە جەستەی منە کەلەپێناو ئێوە بەخت دەکرێت، لەدوای خۆم ئەمە بۆیادکردنەوەم ئەنجام بدەن...) ﴿لۆقا**22**/**19**تا**20**﴾

**"ئەمە خوێنی منە"[155]**

**عیسای مەسیح (نان و شەراب)ی وەك لاشە و خوێنی خۆی دانا، بە هاوەڵانی خۆی فەرمانی دا کە ئەم ڕێوڕەسمە پیرۆزە لەدوای ئەو ئەنجام بدەن، ئێستا لە هەموو کلێساکانی سەرتاسەری جیهان ئەم فەرمایشتەی مەسیح جێبەجێدەکرێت، مەسیحییەکان کاتی ئەنجامدانی ئەو ڕێوڕەسمە، یەك بار لەتێك نان دەخۆن و کەمێك شەراب یان ئاوی ترێ دەخۆنەوە، بەم کارە دەیهێننەوە بیری خۆیان کە عیسای مەسیح لەبەر خاتری ئەوان و مرۆڤایەتی گیانی خۆی بەخت کرد و هێزی ئەو بە هۆی ئیمانەوە لە دڵی خۆیاندا جێگادەکەنەوە، مەسیحییەکان لەم ڕێوڕەسمە پیرۆزە بەرەکەتی ڕۆحانی زۆر بەدەست دەهێنن.[156]**

## حەوتەم: هاوسەرگیری

**ئامۆژگاری و فێرکارییەکانی عیسای مەسیح لەبارەی هاوسەرگیرییەوە، ئەوەیە کە دەبێ بە تەنها یەك ژن و یەك پیاو یەکبگرن و وە دەشبێت تا کۆتایی تەمەنیان یەکتریان خۆش بوێت و بەرامبەر یەکتری بەوەفابن. عیسا فەرموویەتی:**

**"ئەوەی خودا بە یەکتری گەیاندووە، بامرۆڤ جیایی نەکاتەوە"[157]**

**کەوابوو تەڵاق وەرگرتن ڕێگا پێدراو نییە لای مەسیحییەکان بەهیچ هۆکارێك جگە لە (داوێنپیسی)کردن.[158]**

---

[155](ئەم جامە پەیمانی نوێیە بەخوێنی من، کە بۆ ئێوە دەرژێت...) ﴿لۆقا**22/20**تا**21**﴾

[156](ئەوەی بە ئێوەم دا لە مەسیحی خاوەنشکۆم وەرگرتووە: ئەوە بوو عیسای خاوەنشکۆ لەو شەوەی کە تێیدا بەگرتن درا، نانێکی هەڵگرت، سپاسی خودای کرد و لەتی کرد، فەرمووی: ئەمە جەستەی منە کە بۆ ئێوەیە، ئەمە بۆ یادکردنەوەی من بکەن. بەهەمان شێوە جامەکەی پاش نانخواردن هەڵگرت و فەرمووی: ئەم جامە پەیمانی نوێیە بە خوێنی من، هەرجارێك دەیخۆنەوە ئەمە بکەن بۆ بەیاد هێنانەوەم. جا هەرکاتێك لەم نانەتان خوارد و لەم جامەتان خواردەوە، ئەوا مردنی عیسای خاوەنشکۆ ڕادەگەیەنن، هەتا دێتەوە.

کەواتە ئەوەی بە شێوازێکی ناشایستە_بەبێ ڕێزگرتن لە مەسیح_ نانەکە بخوات یان لە جامەکەی مەسیحی خاوەنشکۆ بخواتەوە ئەوا بەرامبەر بە جەستە و خوێنی مەسیحی خاوەنشکۆ تاوانبارە، با هەرکەسێك خۆی تاقیبکاتەوە، ئینجا لە نانەکە بخوات و لە جامەکە بخواتەوە، چونکە ئەوەی بخوات و بخواتەوە بێ ئەوەی ڕێز لە جەستەی مەسیح بگرێت، ئەوا بۆ خۆی حوکم دەخوات و دەخواتەوە، لەبەر ئەمەیە کە زۆر نەخۆش و لاوازتان تێدایە و هەندێکیش نوستوون_مەبەست لەمردنە_...)

﴿یەکەم کۆرنسۆس**23/11**تا**31**﴾

[157]﴿مەتا**19/6**تا**7**﴾

[158](هەندێك فەریسی هاتنە لای عیسا بۆ ئەوەی تاقی بکەنەوە، گوتیان: ئایا دروستە مێرد لەبەر هەر هۆیەك بێت ژنەکەی تەڵاق بدات؟

عیسا فەرمووی: ئەی نەتان خوێندۆتەوە _مەبەستی لە تەوراتە_ ئەوەی لەسەرەتاوە بەدیهێناوە بە نێر و مێ بەدیهێنان؟ هەروەها فەرمووی: لەبەر ئەوە پیاو دایك و باوکی خۆی بەجێدەهێڵێت و بەژنەکەیەوە دەنوسێت، ئیتر هەردووکیان دەبنە یەك جەستە_ئەم وتانەی عیسا لە پەیمانی کۆن/پەیدابوون27/1 و پەیدابوون24/2دا نوسراون_ کەواتە چیتر دوو نین بەڵکو یەك جەستەن، لەبەر ئەوە ئەوەی خودا بەیەکتری گەیاندووە، با مرۆڤ جیای نەکاتەوە. لێیان پرسیەوە: ئەی بۆچی موسا فەرمانی داوە تەڵاق نامە بدرێت و تەڵاق بکەوێت؟

عیساش فەرمووی: لەبەر دڵڕەقیتان موسا ڕێی دان ژنەکانتان تەڵاق بدەن، ئەگینا لە سەرەتاوە وانەبوو، بەڵام پێتان دەڵێم: ئەوەی "بەبێ هۆی داوێن پیسی" ژنەکەی خۆی تەڵاق بدات و یەکێکی دیکە بهێنێت، ئەوا داوێن پیسی دەکات.

قوتابییەکانی پێیان گوت: ئەگەر حاڵی ژن لەگەڵ پیاو ئاوابێت باشترە ژن نەهێنێت!

**پۆڵسی نێردراو فەرموویەتی دەبێ خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد هاوشێوەی ئەو خۆشەویستییە بێت، کە لەنێوان مەسیح و گەلەکەی بوونی هەیە.**[159]

---

بەڵام عیسا پێی فەرموون: هەموو خەڵکی ناتوانن ئەم قسەیە پەسەند بکەن، تەنها ئەوانەی پێیان دراوە. خەساو هەن زگماکن، خەساویش هەن مرۆڤ خەساندونی، خەڵکیش هەیە بڕیاریان داوە لەپێناو شانشینی ئاسمان وەك خەساو بژین_واتە ئەو باوەڕدارانەی لە پێناو مەسیح و خزمەتکردن بە وی بە ڕەبەنی دەمێننەوە__ کێ دەتوانێت پەسەندی بکات، باپەسەندی بکات...) ﴿مەتا**1/19**تا**13**﴾ و بڕوانە ﴿مەرقۆس**2/10**تا**13**﴾ش.

[159](ئەی ژنان، ملکەچی مێردەکانتان بن هەروەك چۆن ملکەچی مەسیحن، وەك چۆن مەسیح سەری کڵێسایەکە جەستەی خۆیەتی و خۆی ڕزگارکاریەتی، ئاوا پیاو سەری ژنە، بەڵکو چۆن کڵێسا ملکەچی مەسیحە، ژنانیش لە هەموو شتێك بۆ مێردەکانیان. ئەی مێردەکان، ژنەکانتان خۆش بوێت، هەروەك مەسیحیش کڵێسای خۆشویست و لە پێناوی خۆی بەختکرد، تاکو پیرۆزی بکات و بە شوشتنی بە ئاو لەڕێگای وشەوە پاکی بکاتەوە، بۆ ئەوەی کڵێسایەکی شکۆدار بۆخۆی ئامادە بکات، لەکە و لۆچ و هەرشتێکی ئاوای نەبێت، بەڵکو پیرۆز و بێگلەی بێت. بە هەمانشێوە پێویستە پیاوان ژنەکانیان وەك جەستەی خۆیان خۆش بوێت، ئەوەی ژنی خۆی خۆشبوێت خۆی خۆش دەوێت. کەس ڕقی لە جەستەی خۆی نابێتەوە, بەڵکو نانی دەدات و بەخێوی دەکات ، هەروەك چۆن مەسیح بایەخ بە کڵێسا دەدات، چونکە ئێمە ئەندامی جەستەی ئەوین. لەبەر ئەوە پیاو دایك و باوکی خۆی بە جێدەهێڵێت و بە ژنەکەیەوە دەنوسێت، ئیتر هەردووکیان دەبنە یەك جەستە. ئەمە نهێنیەکی گەورەیە بەڵام من باسی مەسیح و کڵێسا دەکەم، ئێوەش با هەر یەکێکتان ژنەکەی خۆی خۆش بوێت، ژنیش ڕێز لە مێردەکەی خۆی بگرێت.)
﴿ئەفسۆس**22/5**تا**33**﴾

(بەشی چواردەهەم)

# فێرکارییە ئەخلاقییەکانی مەسیحیەت کامانەن؟

**لە پەیمانی کۆندا یاسایی زۆر هەیە خودا بە گەلی ئیسرائیلی بەخشیوە، لە (10حوکم)دا کە لە کتێبی (دەرچوون) بەشی بیست نوسراوە، خودا فەرمانی داوە، ڕێزی دایك و باوکمان بگرین و کوشتن و داوێنپیسی و دزی و درۆ و چاوبڕینە کەسانی تر(تەماع) و ..هتد حەرام کردووە، هەروەها دەستورات و یاسایەلی ئەخلاقی زۆر و زەوەندتری بەخشیوە کە یەکێێك لەوانە ئەمەیە:**

**"هاوسێ کەی خۆتت وەك خۆت خۆش بوێت"[160]**

**عیسا هیچ کام لە یاسا ئیلاهییەکانی نەگۆڕی، بەڵکی بەهۆی شرۆڤەکاری مەبەستی بنچینەی ئەم یاسایانە، ئەوانی تەواوتر و کاملتر کرد.[161]**

**بۆ نمونە عیسای مەسیح فەرموویەتی ئەگەر کەسێك_بەچاوی فارزکی(شەهوەت)_ سەیری ژنێکی تر بکات جگە لە ژنەکەی خۆی، ئەوا تۆمەتبار دەبێت بە ئەنجامدانی تاوانی زینا. یاساکانی پەیمانی کۆن مرۆڤی لەسەر ئەنجامدانی زینا مەحکوم دەکرد، بەڵام عیسا تەنانەت ئەو فکرو بیرە شەهوانیانەشی کە لەنێو دڵەوە سەرچاوەیی دەگرت و بناغەی کردەوەی گوناهئامێز دەبوو مەحکوومی دەکرد.[162] ئەو فەرمانی دا تا لە گوفتاردا ڕاستگۆ بین، هەموو شێوەیەکی سوێند خواردنی ڕێگری لێ کرد، باوەڕی وابوو کە دەبێت هەر وشەیەك لە وتراوەکانی مرۆڤ هەقیقەتێکی پەتی و بێ خەوش و تەواو بێت و ئیتر پێویستیەك بە سوێند خواردن نەبێت.[163]**

**وە هەروەها بە شوێنکەوتوانی خۆی فەرموو کە نەك هەر دەبێ یەکتریتان خۆش بوێت بەڵکو دەشبێت دوژمنەکانی خۆیان خۆشبوێت و بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانچەوسێننەوە نزای باشە بکەن. وە هەروەها بەد مەستی و هەموو جۆرە کردەوەیەکی نا ئەخلاقی حەرام کرد، هەروەها فەرمووی کە ڕۆڵەکانی خودا دەبێت کامل و تەواو بن، هەروەك چۆن**

---

[160]﴿لێڤییەکان**18/19**﴾

[161](وا بیرنەکەنەوە من هاتووم تا تەورات یان نوسراوی پێغەمبەران بسڕمەوە، نەهاتووم بۆ سڕینەوەیان بەڵکو هاتووم بۆ تەواو کردنیان...) ﴿مەتا**17/5**تا**18**﴾

[162]( بیستووتانە گوتراوە : داوێن پیسی مەکەن. بەڵام من پێتان دەڵێم: ئەوەی بە هەوەس بازییەوە سەیری ئافرەتێك بکات، ئەوا لە دڵی خۆیدا داوێن پیسی لەگەڵ کردووە، ئەگەر چاوی ڕاستت بۆی بووە کۆسپ، دەریبهێنە و فڕێی بدە، بۆ تۆ باشترە ئەندامێکت لەدەست بچێت لەوەی هەموو لەشت فڕێبدرێتە ناو دۆزەخ، ئەگەر دەستی ڕاستت بۆت بووە کۆسپ، بیبڕەوە و فڕێی بدە. بۆتۆ واباشترە ئەندامێکت لەدەست بچێت لەوەی هەموو لەشت بچێتە دۆزەخەوە.) ﴿مەتا**27/5**تا**30**﴾

[163]( پێشتر بیستووتانە کە گوتراوە: سوێندەکانت مەشکێنە، بەڵکو سوێندەکانت بۆ یەزدان بەرە سەر. بەڵام من پێتان دەڵێم: هەرگیز سوێند مەخۆن نە بەئاسمان، لەبەر ئەوەی تەختی خودایە، نە بە زەوی لەبەر ئەوەی تەختە پێیەتی، نە بەئۆرشەلیم، لەبەر ئەوەی شاری پادشای پایە بەرزە. سوێند بە سەری خۆت مەخۆ چونکە ناتوانی تاڵێك قژت سپی یان ڕەش بکەیت. با قسەتان "بەڵێ" بۆ "بەڵێ" و "نەخێر" بۆ "نەخێر" بێت، لەمە بترازێت لەشەیتانەوەیە _خراپەکارییە_.)
﴿مەتا**33/5**تا**37**﴾

**باوكی ئاسمانیان كامل و تەواوە. هیچ ئامانجێك باڵاتر لەم شتانە ناتوانرێت بدۆزرێتەوە.[164]**

**هەروەها عیسای مەسیح بۆ ژیان دەستوراتێكی دا كە لە هەموو سەرزەمینەكان و لە هەموو كات و دەورەیەكی زەمەنیدا مایەی جێبەجێكردنەو ڕێی تێدەچێت... بۆنمونە فەرموویەتی:**

**" لەهەر شتێكدا ئەوە بەرامبەر بە خەڵكی ئەنجام بدەن و بكەن، كە دەتانەوێ بەرامبەرتان ئەنجام بدرێت و بكرێتەوە، ئەمەیە پوختەی پەیامی پەیامهێنەران لە تەواوی ئەو كاتانەی كە هاتوون".[165]**

**ئەم فێركارییە بە نرخە بە (یاسای ئاڵتوونی) ناودەبرێت. ئەم فێركارییە كامڵ و بناخەدارە، نە تەنها كردەوەی نادروست و هەڵە لە بەرامبەر بەكەسانی تر ڕێگری لێدەكات، بەڵكو ئێمە هاندەدات تا هەموو ئەو باشییانەی دەمانەوێت كەسانی تر بەرامبەر بە ئێمە ئەنجامی بدەن ئێمەش بەرامبەریان ئەنجامی بدەین.**

**زۆر مایەی سەرنجە كە ئینجیل یاسا و ڕێسای، تێروتەسەلی لەبارەی خواردن و جلك و هەموو ئەوبابەتانەی تر كە لە ماوەی زەمەنیدا گۆڕانكارییان بەسەردا دێت، تێدا نییە. بەڵكو لە خۆگری باكگراوەندێكە كە لە هەركات و حاڵێكدا مایەی جێبەجێكردنە و هەر لەبەر ئەمەشە ئەم پەیامە و فەرمایشتەكانی نێوی بە هەمیشەی و زیندووی دەمێنێتەوە.**

**هەموو فێركارییەكانی عیسای مەسیح دەتوانین لە وشەی (خۆشەویستی)دا كورت بكەینەوە.**

**خۆشەویستی عیسا، خۆشەویستییەكی تەواو و كامڵ بوو، بە شاگردان و قوتابییەكانی خۆشی فەرمانی دا یەكترییان خۆشبوێت، هەر بەو شێوەیەی كە خودی خۆی ئەوانی خۆشدەویست.[166]**

**ئێمەی مەسیحی زۆركات، ئەم خۆشەویستییە مەسیحانەیەمان لەناودا نییە، بەڵام كاتێك كە دەیهێنینەوە بیری خۆمان بە چ شێوەیەك مەسیح خۆشەویستی بە ئێمە بەخشیوە و هەروەها بۆ ئێمە گیانی خۆی بەختكردووە، ئەو دەكەینە سەرمەشقی خۆمان و لەوەوە فێردەبین كە كەسانی ترمان خۆشبوێت.[167]**

**ڕۆحی مەسیح، ڕۆحێكی پڕ لە خۆشەویستییە و كاتێك كە مەسیح ڕۆحی خۆی لەناوماندا قەرار دەدات، ئەوكات**

---

[164] ( بیستوتانە گوتراوە: نزیكەكەت خۆشبوێت و ڕقت لە دوژمنەكەت بێتەوە. بەڵام من پێتان دەڵێم: دوژمنەكانتان خۆش بوێت و نوێژبكەن بۆ ئەوانەی دەتانچەوسێننەوە، تاكوو ببنە ڕۆڵەی ئەو باوكەتان كەلەئاسمانە، ئەو خۆری خۆی بەسەر چاك و خراپدا هەڵدێنێت و باران بەسەر پیاوچاك و زۆرداریشدا دەبارێنێت، ئەگەر هەر ئەوانەتان خۆش بوێت كە ئێوەیان خۆش دەوێت، چ پاداشتێكتان هەیە؟! ئایا باجگرانیش ئەمە ناكەن؟ ئەگەر سڵاوتان تەنها لەناسیاوەكانتان كرد، چی زیاترتان كردووە؟ ئایا بتپەرستانیش ئەمە ناكەن؟ بۆیە ئێوە كامڵ و تەواو بن وەك چۆن باوكی ئاسمانیتان كامڵ و تەواوە.) ﴿مەتا**43/5**تا**48**﴾

[165] (لەهەرشتێكدا ئەوە بۆ خەڵك بكەن كەدەتانەوێت بۆتان بكرێت، چونكە ئەمەیە پوختەی تەورات و پەیامی پەیامهێنەران.) ﴿مەتا**12/7**﴾

[166] (بەكۆیلە ناوتان نابەم، چونكە كۆیلە نازانێت گەورەكەی چی دەكات، بەڵام ناوی دۆشتم لێنان چونكە هەرچیەكم لەباوكمەوە بیستبوو، پێم ڕاگەیاندن، ئێوە منتان هەڵنەبژارد، بەڵكو من ئێوە هەڵبژارد، نیشانم كردن تاكو بڕۆن بەرهەم بهێنن و بەرهەمەكەتان بمێنێت، تاكو هەرچییەك بەناوی منەوە داوابكەن، باوك بتانداتێ. بەمانە ڕاتاندەسپێرم تاكو یەكتریتان خۆشبوێت.) ﴿یۆحەنا**15/15**تا**17**﴾

[167] (خۆشماندەوێت چونكە یەكەمجار ئەو خۆشی ویستووین. ئەگەر یەكێك بڵێت خودام خۆش ئەوێت و كەچی ڕقی لە خوشك و براكەی خۆی بێتەوە، ئەوە درۆزنە، چونكە ئەوەی خك و برای خۆی خۆش نەوێت كەبینیویەتی، ناتوانێت خودای خۆش بوێت كەنەیبینیوە، لەئەوەوە ئەم ڕاسپاردەمان دراوەتێ: ئەوەی خودای خۆشبوێت، با خوشكەكە و براكەشی خۆش بوێت.) ﴿یەكەم یۆحەنا**19/4**تا**21**﴾

**دەتوانین هەموو خەڵکی بە دوژمنەکانیشمانەوە خۆشبوێت.[168] ئەم خۆشەویستی و وشانە نابێت تەنها بەزمان بێت یان لەدڵماندا بیهێڵینەوە، بەڵکو دەبێت بەکردەوەش ئەنجامی بدەین و نیشانی بدەین کە بەڕاستی بەو شێوەیەین.**

**(یۆحەنا)ی نێردراو دەفەرموێت کە ئەگەر کەسێك بە توانابێت، یارمەتی برا دەستکورتەکەی خۆی نەدا و پشت گوێی بخات ئەوا خۆشەویستی خودا لەو کەسەدا نیە.**

**بەشێك لە بەرزترین و بە پێزترین ئەوپێناسانەی کە لەبارەی (خۆشەویستی) نوسراون، بە قەڵەمی (پۆڵسی نێرداراو)ە، بۆ نموونە لەم بارەوە پۆڵس دەڵێت:**

**"ئەگەر بەزمانەکانی خەڵك و فریشتە بدوێم، بەڵام خۆشەویستیم نەبێت، ئەوا بوومەتە دەهۆڵی بەگرمە گرم و زوڕنای بە زیڕە زیڕ، ئەگەر پەیامی خودا ڕابگەیەنم و هەموو زانیاری و نهێنییەك بزانم و باوەڕێکی تەواویشم هەبێت بۆ هەڵکەندنی چیا، بەڵام خۆشەویستیم نەبێت، ئەوا هیچ نیم. ئەگەر هەموو سامانم دەرخوارد بدەم و هەتا سوتان لەشم دابنێم، بەڵام خۆشەویستیم نەبێت، ئەوا هیچ سودێکم نابێت.**

**خۆشەویستی پشوو درێژییە، خۆشەویستی نیانییە. خۆشەویستی ئیرەی نییە، شانازی نییە لوتبەرزی نییە، بەدڕەوشتی نییە، بۆخۆی داواناکات، زوو توڕە نابێت و خراپەکان تۆمار ناکات. بە خراپە دڵخۆش نابێت بەڵکو بە ڕاستی دڵشاد دەبێت. بەرگەی هەموو شتێك دەگرێت باوەڕ بە هەموو شتێك دەکات[169]، هیوا بە هەموو شتێك دەخوازێت، بۆ هەموو شتێك ئارام دەگرێت.**

**خۆشەویستی هەرگیز نافەوتێت، بەلاّم ڕاگەیاندنی پەیامی خودا دەوەستێت، قسەکردن بە زمانە ڕۆحییەکانیش کۆتایی پێدێت، زانیاریش نامێنێت، چونکە زانیاریمان سنورداره، هەروەها توانای ئێمە بۆ ڕاگەیاندنی پەیامی خودا سنوردارە، بەڵام کاتێك تەواوەکە دێت، سنوردارییەکە نامێنێت.[170]**

**کە منداڵ بووم، وەك منداڵێك قسەم دەکرد، وەك منداڵێك بیرم دەکردەوە، وەك منداڵێك لێکم دەدایەوە.**

**کە گەورە بووم، ئەوەی هی منداڵ بوو وازم لێ هێنا، جا ئێستا لە تەمدا تەماشای ئاوێنە دەکەین، بەڵام دوای ڕووبەڕووە،**

---

[168]-(خۆشەویستی خودا_مەبەست لە خۆشەویستی خودایە بۆ ئێمە_ ڕژاوەتە ناو دڵمان، بە ڕۆحی پیرۆز کە پێمان دراوە.) ﴿ڕۆما**5/5**﴾

– (سەبارەت بە یەکتری هاوبیر بن، بیر لە بڵندی مەکەنەوە، بەڵکو تێکەڵاوی پایە نزمەکان بن. خۆتان بە دانا دامەنێن. خراپەی کەس بە خراپە مەدەنەوە. وریابن لە بەردەمی هەموو خەڵك ئەوەبکەن کە بە چاك دەزانرێت. بە پێی تواناتان هەوڵبدەن کە لەگەڵ هەموو خەڵك بە ئاشتی بژین. خۆتان تۆڵە مەستێنن. بەڵکو ڕێ بە توڕەی خودا بدەن، چونکە نوسراوە: یەزدان دەفەرموێت تۆڵە سەندنەوە هی منە و منم کە سزا دەدەم، بەڵام ئەگەر دوژمنەکەت برسیی بوو نانی بدەرێ، ئەگەر تینوو بوو ئاوی بدەرێ. بەمە پشکۆی داگیرساو لەسەر سەری کەڵەکە دەکەیت، با خراپە نەت بەزێنێت بەڵکو بە چاکە خراپە ببەزێنە.) ﴿ڕۆما**17/12**تا**21**﴾

[169](مەبەستی هەموو شتێك لە خوداوە).

[170](مەبەستی لەکاتی هاتنی عیسای مەسیحە، کە دێتەوە ئیتر ئەوەی تەواو نییە، لەناو دەچێت).

**ئێستا هەندێك دەزانم ، بەڵام دواتر بەتەواوی دەزانم، هەروەك چۆن تەواو ناسراوم.**

**ئێستا ئەم سیانە دەمێنێتەوە: باوەڕ و هیوا و خۆشەویستی، بەڵام مەزنترین و گرنگترینیان خۆشەویستییە.)**[171]

**خۆشەویستی مەسیح بەرامبەر بە خەڵکی، تەنها بەهۆی وشەکانەوە نەبوو کە دەیفەرموو، بەڵکو لە ڕێگای شیفای نەخۆشان و خواردن پێدان برسییەکان و بەخشینی گیانی لەسەر خاچ بۆ ڕزگاری گوناهکارانیش ئەو خۆشەویستییەی سەلماند.**

**هەر ئەم خۆشەویستی مەسیحەیە کە شوێنکەوتوانی ئەوی وا لێکردووە بە خۆشحاڵی و خەمخۆرییەوە نەخۆشخانە بۆ چارەسەری بیماران و خانەی بێ سەرپەرشتان بۆ بێ کەس و کار و بێ لانەکان و خوێندنگە و فێرگە بۆ منداڵان و زۆر دامەزراوەی تر بۆ خزمەتی خەڵکی لە هەموو نەژاد و ئاین و بیرو باوەڕێك لە جیهاندا بنیاد بنێن بەبێ جیاوازی. عیسای مەسیح دەیهەویست، خۆشەویستی هێما و تایبەتمەندی شوێنکەوتوانی بێت، شوێنکەوتوانی لەنێو هەموو گەلاندا بە نەرم و نیانی و خۆشەویستیاندا بناسرێنەوە.**[172]

**ئێمەی مەسیحی دەبێ زۆر بە شەرمەزارییەوە بڵێین و دانی پێدا بنێین کە: خۆشەویستی مان لە زۆر کاتدا فرە کەم و کورت بووە، بەڵام گشت مەسیحییان بەڕاستی دەیانەوێت هەروەك مامۆستاکەیان _مەبەست عیسای مەسیحە_ بە چواردەوریان و کەسانی تر خۆشەویستی ببەخشن.**

---

[171]﴿یەکەم کۆرنسۆس**13/1**تا**13**﴾

[172]عیسا فەرمووی:

(من ڕاسپاردەی نوێتان دەدەمێ، ئەویش ئەوەیە "یەکتریتان خۆش بوێت"، وەك خۆشم ویستن، ئێوەش بەو جۆرە یەکتریتان خۆش بوێت، بەمە هەموو خەڵك دەزانن کە قوتابی منن، ئەگەر خۆشەویستیتان بۆیەکتری هەبێت.) ﴿یۆحەنا**13/34**تا**35**﴾

**(بەشی پانزەهەم)**

# بیروباوەڕی مەسیحیەکان لەبارەی (داهاتوو)ەوە چییە؟

**هەروەك لە سەرەتای ئەم نوسراوەوە باسم لێوە کرد، مەسیحییەکان بە خودایەکی باڵادەست و بە توانا باوەڕدارن، کە بۆ ئەم جیهانە نەخشەیەکی هەیە، ئەم نەخشەیەیی خوداش بە دڵنیاییەوە باوەڕمان وایە کە وەك چۆن دانراوە ئاوها بەڕێوە دەچێت.**

**کاتێك کە مرۆڤ لە دایك بوو دژ بە خودا هەڵکفا و گوناهبار بوو، خوداش کوڕە تاقانەکەی خۆی بۆ ڕزگاری جیهان نارد.[173]**

**ئەوانەی کە باوەڕ بەناوی ئەو دەهێنن ڕزگاری بەدەست دەهێنن، ئەوانەش کە ئیمان ناهێنن مەحکوم دەبن بە تاوان، لە کۆتایدا خودا خواستی وایە کە هەموو دوژمنەکانی خۆیی بگەڕێنەوە و گوێڕایەڵی بکەن و پادشاهێتی هەمیشەیی خۆی، کە لە ناو ئەو پادشاهێتیەدا هیچ جۆرە گوناه و تاوانێك بوونی نییە بەرقەراربێت، بەڵام خودا بە باشی نەزانیوە هەموو شتەکان بۆ ئێمە بە تەواوی ڕۆشن بکاتەوە.**

**کەوابوو، مەسیحییەکان بە گشتی پەیامی ئەم پەیامبەرانەی کە خودا ناردوونی بە شێوەی جیاواز تەفسیر و شرۆڤە دەکەن.**
**ئێستا ئەو پێشهاتانەی داهاتوو کە مایەیی پەسەندی زۆربەی مەسیحییەکان و بەگشتی باوەڕیان پێیان هەیە، ڕوندەکەمەوە:**

## یەکەم: گەڕانەوەی عیسای مەسیح

**مەسیح، پێش ئەوەی کە بۆ ئاسمان بەرزبکرێتەوە، چەندان جار دڵنیایی بە قوتابیەکانی خۆی دا، کە دەگەڕێتەوە لایان، وە مەسیحییەکانیش تا ئێستا چاوەڕێی هاتنەوەی ئەون. یەکەمین هاتنی عیسای مەسیح بۆ سەر زەویی لەبەر ڕزگاری مرۆڤەکان بووە، بەڵام گەڕانەوەی دووەمی عیسا، بۆ فەرمانڕەوایەتی و بەرقەرارکردنی ویستی خودا و پادشاهێتیەکەیەتی، کاتێك کە قوتابیەکان لە عیسایان پرسی: ئەو چ کاتێك دەگەڕێتەوە، عیسا وەڵامی دایەوە: کە هاتنەوەی ئەو تەنها خودا دەیزانێت.**

**هەروەها وتی پێیان هەمیشە ئامادەی گەڕانەوەی بن، بەڵام کاتێك کە خەڵکی چاوەڕێی گەڕانەوەی ئەو نین، ئەو دەگەڕێتەوە، پێشتر بە قوتابیەکانی فەرموو بوو: بە گەورەی لەگەڵ فریشتەکاندا دەگەڕێتەوە و دەرکەوتنی وەك گوڕی**

---

[173](لەبەر ئەوەی خودا جیهانی زۆر خۆشدەویست، تەنانەت کوڕە تاقانەکەی بەخت کرد، تاکو هەرکەسێك باوەڕی پێ بهێنێت لەناو نەچێت، بەڵکو ژیانی هەتا هەتایی هەبێت، چونکە خودا کوڕەکەی نەناردە جیهان تاکو جیهان حوکم بدات، بەڵکو بۆ ئەوەی نارد جیهان بە هۆی ئەوە ئەوە ڕزگاری ببێت، ئەوەی باوەڕی پێبهێنێت حوکم نادرێت، بەڵام ئەوەی باوەڕ ناهێنێت ئەوە حوکم دراوە، چونکە باوەڕی بە ناوی کوڕەتاقانەکەی خودا نەهێناوە، ئەمەش حوکمەکەیە: ڕوناکیەکە هاتە جیهان بەڵام خەڵك لەبری ڕوناکیەکە، تاریکیەکەیان خۆش ویست، چونکە کردەوەیان خراپ بوو...) ﴿یۆحەنا **3/16**تا**20**﴾

**هەورە گرمە و هەورە تریشقەی ئاسمان لەلایەن هەموو کەسێکی سەر ڕووی زەویەوە دەبینرێت، هەروەها بە قوتابیەکانی فەرموو: کە ئاگاداری ئەو کەسانە بن بەناوی مەسیحەوە دێن و ئاگاداری ئەو پێغەمبەرە درۆزنانەش بن کە بۆ گومڕاکردنی خەڵك دوای خۆی دێن.[174]**

**تا ئەو شوێنەی ئێمە ئاگادارین لەماوەی 1900ساڵی ڕابردوودا درۆزنگەلێکی زۆر هاتوون، بەڵام مەسیحیەکان زۆر لەوە هۆشمەند تر و زیرەکترن کە بەو شتانە فریو بخۆن، چونکی عیسای مەسیح زۆر بە باشی شتەکانی بۆ ڕوون کردوونەتەوە و هەرکەسێك بڵێت ( مەسیح هاتووە و لە فڵانە شوێنە) ئەوە ئەو کەسە بێشك لایان مەسیحی درۆینەیە، چوون کاتێك عیسای مەسیحی ڕاستەقینە لە ئاسمانەوە دێتەوە، هەموو خەڵکی جیهان بە تێکڕا، ئەو دەناسنەوە و پێویست بەوە ناکات کەس کەس ئاگاداربکاتەوە.**

**ئەو کاتەی کە مەسیح بەرزدەکرایەوە بۆ ئاسمان، فریشتەکان بە قوتابیەکانیان گوت:**

**" ئەم عیسایەی کە ئێستا بۆ ئاسمان بەرزکرایەوە، دووبارە دەگەڕێتەوە، هەر بەو شێوەیەی کە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان..."[175]**

**کەوایە عیسای مەسیح دەگەڕێتەوە دووبارە، بەڵام وەك منداڵێکی تازە لەدایك بوو نایەتەوە و سەر لەنوێ ژیان بگوزەرێنێت و بەرە بەرە گەورەببێت و ...هتد، نەخێر ئەو بەو شێوەیەی کە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان هەر ئاواش دەگەڕێتەوە.**

**کتێبی پیرۆز دەڵێت کە عیسا تەنها یەك جار بۆ تاوانەکان و گوناهەکانی مرۆڤ مرد و جارێکی تر سەر لەنوێ نامرێتەوە، چونکە مەرگ ئیتر دەسەڵاتێکی نییە بەسەریدا[176]، کەوابوو ڕوونە لەو کاتەوەی کە بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان تا ئێستا نەگەڕاوەتەوە.**

---

[174](قوتابیەکان وتیان بەعیسا: پێمان بڵێ کەی ئەم شتانە ڕوودەدات؟ هەروەها نیشانەی گەڕانەوەت و کۆتایی زەمانە چییە؟ عیسا وەڵامی دایەوە: ئاگاداربن کەس هەڵتان نەخڵەتێنێت، چونکە زۆرکەس بەناوی منەوە دێن و دەڵێن مەسیحین و زۆر کەس هەڵدەخڵەتێنن، هەروەها جەنگ و دەنگ و باسی جەنگ دەبیستن، ئاگاداربن و نەترسن، پێویستە ئەمانە هەمووی رووبدات، بەڵام هێشتا کۆتایی نییە، چونکە میللەتان دەچن بەگژ یەکتریدا و پادشایەتی بەگژ پادشایەتی تردا، برسێتی و بوومەلەرزە لە زۆر شوێن روودەدات، بەڵام ئەمانەش هەمووی ژانی یەکەمە، ئینجا خەڵك دەتاندەن بە دەستەوە بۆ ئازاردان و دەتانکوژن، هەموو گەلان لەپێناو ناوی من ڕقیان لێتان دەبێتەوە، هەروەها زۆرکەس لە باوەڕیان وەردەگەڕێن و یەکتری دەدەن بە دەستەوە و ڕقیان لە یەکتر دەبێت، زۆر پێغەمبەری درۆزن دەردەکەون، زۆرکەس هەڵدەخڵەتێنن، ئینجا کە گوناه بڵاوبوەوە، خۆشەویستی لەدڵی زۆرکەس نامێنێت، بەڵام ئەوەی تا کۆتایی خۆی ڕادەگرێت، ڕزگاری دەبێت. مزگێنی ئەم پادشاهێتییە لە هەموو جیهان ڕادەگەیەنرێت، وەك شایەتییەك بۆ من لای هەموو میللەتان، ئینجا کۆتایی دێت.) ﴿مەتا**3/24**تا**15**﴾

[175](ئیتر عیسا بۆ ئاسمان بەرزکرایەوە و قوتابیەکانیش تەماشاین دەکرد کاتێك بەرزکرایەوە، هەورێك لەبەرچاویان عیسای شاردەوە، کاتێك عیسا ڕۆشت قوتابیان و شوێنکەوتووان سەرنجیان لە ئاسماندا بوو، ئەوەبوو دووپیاو_فریشتە_بە جلی سپییەوە لەلایانەوە ڕاوەستان، پێیان گوتن: جەلیلییەکان بۆچی ڕاوەستاون سەیری ئاسمان دەکەن؟ ئەم عیسایە، کە لە نێوتاندا بۆ ئاسمان بەرزکرایەوە، چۆن بینیتان چووە ئاسمان ئاواش دەگەڕێتەوە.) ﴿کرداری نێردراوان**9/1**تا**12**﴾

[176](مەسیح کە لەنێو مردواندا هەستێنرایەوە، نامرێتەوە، ئیتر مردن دەسەڵاتی بەسەریدا نییە، ئەو مردنەی مرد، تەنها جارێك بوو کە لەبەر گوناه مرد. بەڵام ئەو ژیانەی دەژێت بۆ خودا دەژییێت.) ﴿ڕۆما**8/6**تا**11**﴾

**کاتێك کە عیسای مەسیح لـەنێو مردواندا هەستایەوە، لاشە و بوونی(مادی) ئەو گۆڕا بە لاشەو بوونێکی(ڕۆحانی) کە مەرگ ئیتر بەسەریدا دەسەڵاتی ناشکێت، هەر لـەم ڕووەوە عیسا ئیتر باڵادەست بوو بەسەر مەرگدا و نەمری وەك فریشتەکانی ئاسمان بەدەست هێنا، وە هەروەکو ئەوانیش هەمیشە نادیارێکی دیارە(واتە لـەهەموو لایەك چاودێرمانە).**

**عیسا بە بوونی لاشە و بوونێکی ڕۆحانی، ئێستا لـە ئاسمانە و ئێمە باوەڕدارین کە بە هەمان بوون و لاشەی ڕۆحانیەوە دەگەڕێتەوە، سەر لـەنویێ خۆی نیشانی هەموو خەڵك دەداتەوە. لـەبەر ئەوەی مەسیحییەکان زۆرکات لـە پێشگۆیی کات و شوێنی گەڕانەوەی مەسیح دووچاری هەڵـە هاتوون، وا باشە کە ئێمەش لـە دووبارەکردنی ئەم هەڵانە خۆمان بپارێزین و دوورکەوینەوە، هەمووان دەبێت بە شێوەیەك ژیان بگوزەرێنین و خواوەندی خۆمان بەشێوەیەك خزمەت بکەین کە هەرکاتێك ئەو گەڕایەوە، بۆ پێشوازی لـێکردنی ئامادەبین.**[177]

**ئەو کاتەی کە مەسیح دەگەڕێتەوە چی دەکات؟**

**وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە لـە کتێبی پیرۆزدا بەتەواوی ڕوون نەکراوەتەوە، هەندێك لـە مەسیحییەکان باوەڕیان وایە کە مەسیح ئەو کاتەی دێتەوە هەموو تاوانکاری و گوناهکارییەکانی جیهان لـەنێو دەبات و دەسەڵاتی خودا لـەسەر زەوی دادەمەزرێنێت و سەرقاڵی ئەو پادشاهێتییە دەبێت، وە تەواوی خەڵك ملکەچی خواستی ئەو پادشایەتی خودا دەبن و ژیان لـەژێر ئەو فەرمانڕەوایەتی و پادشاهێتییە ئیلاهییەی ئەودا بە یەکسانی و ئاشتی سەرتاسەری بەڕێوە دەچێت و هەموولایەك دەحەسێنەوە.**

**ئەوکات ژیان لـەسەر ڕووی زەوی بە شێوەیەکی لـیێ دێت، کەخودا خۆی نەخشەی بۆ کێشابوو پێش ئەوەی مرۆڤ دژی ئەو تاوان ئەنجام بدات. وە هەندیێ لـە مەسیحییەکان باوەڕیان وایە کە فەرمانڕەوایەتی مەسیح وەك فەرمانڕەوایەتی پادشایان دنیایی لـەم ژیانەدا نییە، بەڵکو کارەکانی ئەو بەبیێ شك لـەسەروو دونیا بینی ئێمەوە دەبێت و سەرسامکەرانە و پەرجوو ئامێز دەبێت.**

**ڕاستییەکەی گرنگییەکی وای نیە کە تەواوی ئەم نهێنیانە بزانین، بەڵام پێویستە کە هەمووان بۆ گەڕانەوەی ئەو خۆمان ئامادە بکەین.**

## دووەم: هەستانەوەی گشتی

**عیسای مەسیح فەرمووی:**

**"ڕاستیتان پێدەڵێم، ئەوکاتە دێت و ئەوەتا ئێستا هاتووە، کە مردووان گوێیان لـە دەنگی ڕۆڵـەی خودا دەبێت زیندوو دەبنەوە، چونکە هەروەك چۆن باوك سەرچاوەی ژیانە، بەم جۆرەش بە ڕۆڵـەی خۆی داوە کە سەرچاوەی ژیان بێت،**

[177]-﴿مەتا**1/24**تاکۆتایی بەشی **24**﴾ -﴿مەتتا**1/25**تا کۆتایی بەشی **25**﴾

**دەسەڵاتی حوکم بەسەردانی داوەتێ، چونکە ئەو ڕۆڵەی مرۆڤە، سەرتان لەمە سوڕنەمێنێت: کاتێك دێت هەموو ئەوانەی لەناو گۆڕدان، گوێیان لە دەنگی دەبێت و دێنە دەرەوە، جا ئەوانەی کرداری چاکیان کردووە، بەرەو هەستانەوەی ژیان دەڕۆن، بەڵام ئەوانەی کرداری خراپیان کردووە بەرەو هەستانەوەی حوکم بەسەردادان دەڕۆن..."[178]**

**بەم فەرموودانەی، عیسای مەسیح بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە ئەو خۆی هەموو مردوان زیندوو دەکاتەوە و هەر بەو شێوەیەی کە کاتێك لە (فەڵەستین) دەژیا، هەندێك خەڵکی مردووی زیندوو کردەوە.**

**کاتێك کە مردووان زیندوو بونەوە، چ جۆرە لاشە و بوونێکیان دەبێت و چۆن دەبن؟**

**پۆڵسی نێردراو دەفەرموێت: لاشە و بوونی (مادی) ئیمانداران لەو ڕۆژەدا کە زیندوو دەبنەوە دەگۆڕێت، هەروەك ئەوە وایە لاشەمان تۆوێك بێت کاتێك دەنێژرێین و دواتر گیایەکی نوێ و بوونێکی نوێ لە ئێمەوە لەزەوی سەردەردێنێت و بەشێوەیەکی نوێ و جیاواز هەڵدەستینەوە لە مەرگ.[179]**

**عیسا لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە سەبارەت بە ژیانی داهاتوو پرسیاریان لێ دەکرد فەرموویەتی: لە ژیانی داهاتوودا هیچ جۆرە هاوسەرگیری و پەیوەندییەکی سێکسی و بەدەنی بوونی نییە، بەڵکو ئیمانداران وەك فریشتەکانی خودایان لێ دێت.[180]**

## سێیەم: دادوەری کردنی کۆتایی

**مەسیح نەك هەر مردووان زیندوو دەکاتەوە، بەڵکو هەموو خەڵکیش دادوەری دەکات، ئەوە کە هەق و حساب لەگەڵ شتەکان دەکات، عیسای مەسیح فەرمووی: هەموو میلەتان لە بەردەم ئەودا کۆدەکرێنەوە و ئەو لە یەکیان جیادەکاتەوە، هەر بەو شێوەیەی شوانی ڕانە مەڕێك مەڕەکانی خۆی لە بزنەکانی جیادەکاتەوە، ئەو کەسانەی کە یامەتی لێقەوماوان و نیازمەندانیان داوە و خۆشەویستیان تەکیاندا نواندووە عیسا پێیان دەفەرموێت:**

**" کاتێك ڕۆڵەی مرۆڤ لەگەڵ فریشتەکانی بە شکۆمەندی دەگەڕێتەوە، دادەنیشێت لەسەر تەختی شکۆمەندی خۆی، هەموو نەتەوەکان کۆدەبنەوە لەبەردەمیدا، ئەویش هەندێکیان لەوی دیکەیان جیادەکاتەوە، وەك چۆن شوان، مەڕ لە بزن جیادەکاتەوە، جا مەڕەکان لای ڕاستی خۆیەوە ڕادەگرێت و بزنەکانیش لای چەپییەوە، ئینجا پادشا بەوانەی لای ڕاستییەوە دەڵێ: وەرن ئەی ئەوانەی باوکم پیرۆزی کردوون، ئەو پادشاهێتییە وەرگرن کە لەسەرەتای دروست کردنی جیهانەوە بۆتان ئامادە کراوە، چونکە برسی بووم تێرتان کردم، تینوو بووم ئاوتان پێدام، نامۆ بووم جێگاتان کردمەوە،**

---

[178]﴿یۆحەنا **5/25**تا**30**﴾

[179]بڕوانە ﴿یەکەم کۆرنسۆس**15/1**تاکۆتای بەشی **15**﴾

[180](خەڵکی لە کاتی زیندوو بونەوەدا نە ژن دەهێنن و نە شوودەکەن، بەڵکو لە ئاسمان وەك فریشتە دەبن...) ﴿مەتا**22/29**تا**30**﴾

**ڕووت بووم جلتان لـەبەر کردم، نەخۆش بووم سەرتان لـێدام و دیل بووم هاتن بۆلام. ئەوسا ڕاست و دروستان و چاکەکاران وەڵام دەدەنەوە دەڵێن: ئەی گەورە، کەی تۆمان بە برسێتی دیوە نانمان داویتیٚ؟ یان تینوت بوو بێت و ئاومان دابیتیٚ؟ کەی تۆمان بەنامۆیی دیوە و جێگەمان کردوویتەتەوە یان ڕووت بوبیت و جلمان لـەبەر کردبیت؟ کەی تۆمان بە نەخۆشی یان دیلی دیوە و سەرمان لـێداویت؟ ئینجا پادشا وەڵامیان دەداتەوە: ڕاستیتان پێدەڵێم هەر شتێك ئێوە بۆ یەکێك لـەم برا بچووکانەم کردووتانە_مەبەستی لـەو چاکانەیە کە بەرامبەر بە مرۆڤانی تر لـەم دنیایە دا دەیکەین_ بۆ منتان کردووە. دوای ئەوە بەوانەی لای چەپییەوە ڕاوەستاون دەڵێت: دوور کەونەوە لـێم ئەی نەفرەت لـێکراوینە بۆ دۆزەخی هەتا هەتایی، ئەوەی بۆ شەیتان و دەست و پێوەندەکەی ئامادەکراوە. چونکە برسیی بووم تێرتان نەکردم، تینوو بووم ئاوتان نەدامیٚ، نامۆ بووم شوێنتان نەکردمەوە، ڕووت بووم جلتان لـەبەر نەکردم، نەخۆش بووم سەرتان لـێنەدام، دیل بووم نەهاتنە لام، ئینجا ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە، دەڵێن: ئەی گەورە، کەی تۆمان دیوە بە برسێتی بە تینوێتی، بە نامۆیی، بە ڕووتی، بە نەخۆشی، بە دیلی و یارمەتیمان نەداویت؟ ئەویش وەڵامیان دەداتەوە: ڕستیتان پیٚ دەڵێم هەر شتێکتان بۆ یەکێك لـەم برا بچوکانەم نەکردووە، بۆ منتان نەکردووە. ئینجا ئەوانە بۆ سزای هەتا هەتای دەچن و ڕاست و دروستەکانیش بۆ ژیانی هەتا هەتایی."[181]**

**بەم شێوەیە خودا بەهۆی کوڕەکەیەوە، مەحکەمە و هەق و حساب لـەگەڵ هەموو مرۆڤایەتیدا دەکات، ئێمە سەر بە هەر میلـلـەت و ئاین و بیروباوەڕێك بین، ڕۆژێك دێت لـەبەردەمی عیسای مەسیحدا دەوەستین، تا بەپێی کردەوەکانمان کە لـە ژیاندا ئەنجاممان داون دادگایی بکرێین.[182] ئەڵبەتە ئەویش دادوەرێکی عادلـە و لـە ڕووی عەدالـەت و ڕەحمەتی خۆیەوە دادوەری هەموو لایەك دەکات.**

**ئایا کەس هەیە لـەم ڕۆژی دادگایی کردنە نەترسێت؟**

**بەڵیٚ ئەوانەی کە باوەڕێکی ڕاستەقینەیان بە عیسای مەسیحی ڕزگاریکار هەیە، لـە دادگاکەی مەسیحدا هیچ ترسێکیان**

---

[181]﴿مەتا**31/25**تا**46**﴾

[182]**-** عیسا فەرمووی: (ڕاستیتان پێدەڵێم، کوڕەکە_مەبەستی خۆیەتی_ ناتوانێت لە خۆیەوە هیچ شتێك بکات، ئەوە نەبێت کە دەبینێت باوك دەیکات، چونکە هەرچییەك باوك دەیکات، کوڕەکەش دەیکات. باوك کوڕی خۆی خۆش دەوێت و هەموو ئەوەی نیشان دەدات کە دەیکات، کاری لەمانەش مەزنتری نیشان دەدات، تاکو سەرسام بن. وەك باوك مردوان هەڵدەستێنێتەوە و زیندوویان دەکاتەوە، بەو جۆرەش کوڕەکەی ئەوەی بیەوێت زیندووی دەکاتەوە. هەروەك باوك کەس حوکم نادات، بەڵکو هەموو حوکم دانێکی داوەتە دەست کوڕەکەی، تاکو هەموو ڕێزی کوڕەکە بگرن هەروەك ڕێزی باوك دەگرن، ئەوەی ڕێزی کوڕەکە نەگرێت، ڕێزی باوکیش ناگرێت کە ناردوویەتی.) ﴿یۆحەنا**19/5**تا**24**﴾

– (لەبەر ئەوەی کە نەوەی خوداین، پێویستە وا بیرنەکەینەوە کە خودایەتی لە پەیکەری زێڕ یان زیو یان بەردینە، کە داهێنان و بیری مرۆڤ شێوەی کێشاوە. لەسەردەمانی نەزانیدا خودا چاو پۆشی کردووە، بەڵام ئێستا فەرمان دەدات بە هەموو کەسێك لە هەموو شوێنێك کە تۆبە بکەن، چونکە ڕۆژێکی داناوە تێیدا بە نیازە بە دادوەری جیهان حوکم بدات بەپیاوێك کەدیاری کردووە، بەڵگەشی بە هەموان داوە کە لە نێو مردووان هەڵیستاندەوە...) ﴿کردار**29/17**تا**32**﴾

– ( هەموومان لەبەردەم تەختی دادگایەتی مەسیح دەبین و دەچینەوە بەردەم ئەو تەختە، تاکو هەرکەس بۆ ئەو شتانەی کە بەهۆی جەستەیەوە کردوویەتی شایستەی خۆی وەربگرێت، ئەگەر باشە یاخود خراپە.) ﴿دووەم کۆرنسۆس**9/5**تا**11**﴾

**نابێ هەبێت، چوون عیسا فەرموویەتی:**

**"ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم: ئەوەی گوێ لە وشەکانم بگرێت و باوەڕبهێنێت بەوەی ناردوومی ژیانی هەتا هەتایی دەبێت، وە لە ڕۆژی دوایدا حوکم نادرێ، چونکە ئەو کەسە لە مردنەوە پەڕیوەتەوە بۆ ژیان..."[183]**

**کەواتە گەرچی باوەڕدارانی مەسیحی بێگوناه نین، بەڵام بەهۆی خوداوە پارێزراون، لەبەر ئەوەی باوەڕدارن بەوەی مەسیح لەبری ئەوان گیانی بەخت کردووە، لە دادگاکەی مەسیحدا باوەڕداران لەبەر خاتری وەفادریان پاداشت دەدرێنەوە .[184]**

**چارەنوسی ئەوانەی کە باوەڕ بە عیسای مەسیح ناهێنن چی دەبێت؟**

**ئەوانەی کە باوەڕ بە عیسای مەسیح ناهێنن مەحکوم دەبن و سزادەدرێن، هەروەك مەسیحیش فەرموویەتی:**

**"خودا ڕۆڵەی نەنارد بۆ تاوانبارکردنی جیهان، بەڵکو ناردی تا جیهان ڕزگار بکات، ئەوەی باوەڕیی پێ دەهێنێت تاوانبار ناکرێت، بەڵام ئەوەی باوەڕیی پێ ناهێنێت تاوانبار کراوە، چونکە باوەڕی بەناوی تاقە ڕۆڵەی خودا نەهێناوە، ئەمەش حوکمەکەیە: ڕووناکە هات بۆ جیهان بەڵام خەڵکەکە حەزیان لە تاریکی کرد لەجیاتی ڕووناکی چونکە کردەوەییان خراپ بوو..."[185]**

**ئەوانەی کە کوڕی خودایان ڕەتکردەوە، ئەوە نەزان بوون و خودایان ڕەتکردەوە، وە لە ڕاستیشدا هیچ گوناهێك لەمە گەورەتر نییە.**

---

[183] ﴿ یۆحەنا **5/24**تا**25**﴾

[184] **-** لەم بارەوە عیسا بەنموونەیەك دواوە و فەرموویەتی:

(پادشایەتی ئاسمان لە پیاوێك دەکات کە دەیەوێت گەشت بکات، کۆیلەکانی بانگ دەکات و ماڵەکەیان دەداتە دەست، بە یەکێکیان پێنج بەش و بەوی کە دوو بەش و بە سێهەم یەك بەش زیویان پێدەدات، هەریەکە بە پێی توانای خۆی، ئینجا دەڕوات. ئەوەی پێنج بەش زیوەکە وەردەگرێت، یەکسەر دەڕوات و دەست دەکات بە بازرگانی پێوەی، ئەوسا پێنج بەشی دیکەش بەدەست دەهێنێت. هەروەها ئەوەی دوو بەشەکە وەردەگرێت هەمان شت دەکات، ئەویش دوو بەشی دیکە بە دەست دەهێنێت. بەڵام ئەوەی یەك بەشەکە وەردەگرێت، دەڕوات لە زەویدا چاڵێك هەڵدەکەنێت و زیوی گەورەکەی تێدا دەشارێتەوە. دوای ماوەیەکی زۆر کاتێك گەورەی ئەو کۆیلانە دەگەڕێتەوە، بانگیان دەکات بۆ لێپرسینەوە. ئەوەی پێنج بەشەکەی وەرگرتبوو، دێتە پێشەوە پێنج بەشی کەش لەبەردەمی دادەنێ و دەڵێ: گەورەم تۆ پێنج بەشت دامێ ئەمەش پێنج بەشی ترە کە بەدەستم هێناوە. گەورەکەی پێی دەڵێت: باشت کرد ئەی کۆیلەی چاك و دەست پاك، دەست پاك بوویت لەکەمدا، زۆرت پێ دەسپێرم، وەرە ژوورەوە بۆ خۆشی گەورەکەت، هەروەها ئەوەی دوو بەشەکەی وەرگرتبوو دێت و دەڵێت: گەورەم تۆ دوو بەشت دامێ، ئەمەش دوو بەشی دیکەیە کە بەدەستم هێناوە. گەورەکەی پێی دەڵێت: باشت کرد ئەی کۆیلەی چاك و دەست پاك، دەست پاك بوویت لە کەمدا، زۆرت پێدەسپێرم و وەرە ژوورەوە بۆ خۆشی گەورەکەت. ئینجا ئەوەی یەك بەشەکەی وەرگرتبوو دێت و دەڵێت: گەورەم، زانیم تۆ پیاوێکی دڵڕەقی دروێنە دەکەیت لە شوێنێك کە نەتڕواندووە، کۆ دەکەیتەوە لە شوێنێك کە نەتچاندووە، ترسام و ڕۆشتم بەشە زیوەکەم لەناو زەویدا شاردەوە. ها ئەوە ماڵەکەتە. گەورەکەی پێی دەڵێت: ئەی کۆیلەی خراپ و تەوەزەل! زانیت من دروێنە دەکەم بێ ڕواندن و کۆدەکەمەوە بێ چاندن، جا باشتر وا بوو ماڵەکەمت لای پارە گۆڕەوەکان دابنایە، تا دوای گەڕانەوەم لەگەڵ سوودەکەی وەرمبگرتایەتەوە. ئا ئەو بەشەی لێبستێنەوە و بیدەن بەوەی دە بەشەکەی پێ بوو. هەرکەسێك هەیبێت زۆرتری پێ دەدرێت، تا لێی دەڕژێت، بەڵام ئەوەی کە نییەتی ئەوەشی کە هەیەتی لێ ی دەسەندرێتەوە. ئا ئەم کۆیلە بێسوودە فڕێ بدەنە تاریکی دەرەوە، جا لەوێ دەبێت بەگریان و چرکە چرکی ددان.) ﴿مەتا**25/14**تا**31**﴾

– (ئەو بناغەیەی لای ئێوە دانراوە، عیسای مەسیحە، کەس ناتوانێت بناغەیەکی تر دابنێت، بەڵام ئەگەر یەکێك لەسەر ئەو بناغەیە بە زێڕ یان بەزیو یان بە بەردی گرانبەها، یاخود بەدار و پوش و کا دروست بکات، ئەوکاتە کاری هەریەکێك دەردەکەوێت، چونکە ڕۆژی لێپرسینەوە ئاشکرای دەکات، لەبەر ئەوە کرداری هەریەکێك بە ئاگر ڕادەگەیەنرێت و بەئاگر تاقی دەکرێتەوە...) ﴿یەکەم کۆرنسۆس**3/11**تا**14**﴾

[185] ﴿یۆحەنا**3/17**تا**19**﴾

هاوڕێی خۆشەویستم..

ئێستا بە باشی دەتوانن تێبگەن لەوەی بۆچی ئێمەی مەسیحی زۆر تامەزرۆین هەموو خەڵك کە لەهەرشوێنێکی ئەم جیهانە بێت، مەسیح وەك خۆی بناسێت و وە باوەڕی پێ بهێنێت، چونکی ئەگەر مەسیح ڕەتبکەینەوە خوداش ئێمە ڕەتدەکاتەوە.

## چوارەم: بەهەشت و جەهەنەم

ئەوانەی بەهۆی عیسای مەسیحەوە پارێزراون بەرەو لای خودا دەڕۆن و بۆ هەمیشە لەگەڵ ئەو لە خۆشەیستی و شادیدا دەیگوزەرێنن، عیسا فەرمووی:

"دڵتەنگ مەبن. ئێوە باوەڕتان بە خودا هەیە، کەواتە باوەڕیش بە من بکەن. ماڵی باوکم زۆر فراوانە و خانویەلی زۆری لێیە، گەر وانەبووایە ئەوسا پێم دەگووتن، من دەڕۆم بۆ ئەوێ تا شوێنتان بۆ ئامادە بکەم. دوای ئەوە ڕۆشتم و شوێنم بۆ ئامادەکردن، دەگەڕێمەوە لاتان و لەگەڵ خۆم دەتان بەم، تاکو ئێوەش لەو شوێنە بن کە منی لێ دەبم..."[186]

لە بەشی کۆتای کتێبی پیرۆزدا، یۆحەنای نێردراو مەزناهی و گەورەیی مانەوە لە حزور و بارەگای خودا بەم شێوەیە باس دەکات:

"ئاسمانێکی نوێ و زەوییەکی نوێم بینی، چونکە ئاسمانی یەکەم و زەوی یەکەم بەسەرچوون، ئیتر دەریاش نەما. شارە پیرۆزەکەش، ئۆرشەلیمی نوێم بینی لە ئاسمانەوە لەلایەن خوداوە دەهاتە خوارەوە، وەك بووکێکی ڕازاوە بۆ زاوایەك ئامادە کرابێت. گوێم لە دەنگێکی گەورە بوو لە تەختەکەوە فەرمووی: ئەوەتا نیشینگەی خودا لەگەڵ خەڵك، ئەویش لەگەڵیان نیشتەجێ دەبێت. ئەوانیش دەبن بە گەلی ئەو، خودا خۆی لەگەڵیاندایە و دەبێتە خودای ئەوان. ئەویش هەموو فرمێسکێکی چاویان دەسڕێتەوە، ئیتر مردن نابێت، شیوەن و هاوار و ئازار نامێنن، چونکە شتەکانی پێشوو بەسەر چوون. دانیشتووی سەر تەختەکە فەرمووی: ئەوەتا هەموو شتێك نوێ دەکەمەوە.

هەروەها دەفەرمویێت: بنوسە چونکە ئەم وتانە متمانەدار و ڕاستن.

پاشان پێی فەرمووم: ئەوا هاتە دی من ئەلف و یێم[187] و سەرەتا و کۆتایم. لەکانی ئاوی ژیان بە خۆڕایی دەدەمە تینوو. ئەوەی سەر بکەوێت ئەوانەی بە میرات بۆ دەمێنێتەوە، دەبمە خودایی و ئەویش دەبێتە کوڕم ."[188]

ئەمەیە ئەو بەهەشتەی کە بۆ ڕۆڵەکانی خودا بەرهەڤ کراوە، گەورەیی و جوانی ئەو شوێنەش لەسەروو بیرکردنەوەکانی

[186]﴿یۆحەنا14/1تا5﴾

[187]لە یۆنانی نوسراوە ئەلفا و ئۆمێگا، یەکەم و دواین پیتی ڕێنوسی یۆنانییە، مەبەستی لەسەرەتا و کۆتاییە.

[188]﴿ئاشکراکردن21/1تا8﴾

ئێمەیە.[189]

چارەنوسی ئەوانەی کە ڕۆڵەی گوێڕایەڵی خودا نین بەکوێ دەگات؟

خودا دەفەرموێت:

"ترسنۆك و بێباوەڕ و قێزەونان، هەروەها بکوژ و داوێن پیس و جادووگەر و بتپەرستان، لەگەڵ هەموو درۆزنان، بەشیان لە دەریاچەی بە ئاگر و گۆگرد داگیرساوە، کە مردنی دووەمە."[190]

جەهەنەم بە مانای دوورکەوتنەوەی یەکجارییە لە نور و خۆشەویستی خودا و بە هیچ زمانێك ناتوانین ترسناکی ئەو شوێنە باس بکەین. خۆزگا هەموو خەڵك لە جێگای ئەوەی بڕۆنە ئەو شوێنە و سزای هەمیشەیی بدرێن لە ژیانی هەمیشەی و پڕ لە شادیدا بوونایە.

## پێنجەم: مەرگی باوەڕداران

ئایا باوەڕداران مەسیحی _باوەڕدار بە عیسای مەسیح_لەمەرگ دەترسن؟ نەخێر، ئەوان لە مەرگ ناترسن، لەبەر ئەوەی مەسیح گفتی داوە کە کاتێك مردن لەگەڵیان بێت وەك چۆن لێرە چاودێریانە.[191] پۆڵسی پەیامهێن، کاتێك کە وادیاربوو لەناو ڕۆمدا لە سێدارە دەدرێت، گوتی:

"حەز دەکەم ئەم جیهانە بەجێ بهێڵم و لەگەڵ مەسیح بژیم، ئەمە زۆر باشترە بۆ من..."[192]

کاتێك کە خەڵکی سەری سوڕدەمێنێت لەوەی کە دەبینن مەسیحییەکان لە کۆبوونەوەی پرسەی خۆشەویستانیاندا سروودگەلی شادی دەخوێنن. هۆکاری ئەم بابەتە ئەوەیە کە ئێمە دەزانین ئەوان بەڕاستی نەمردوون، بەڵکو بۆ لای مەسیح ڕۆشتوون و هەر لەبەر ئەمەیە کە ڕاستە بۆ دووری ئەوان ناڕەحەت دەبین و فرمێسك دەڕێژین بەڵام دڵخۆشیشین، لەبەر ئەوەی دەزانین بۆ لای مەسیح دەچن.

لە کۆتایدا:

هاوڕێی بەنرخم، لێرەدا ئەم نوسراوە بەکۆتا گەیشت، هیوادرام توانیبێتم وەڵامی ڕازیکەرم بە هەندێ لەو پرسیارانە دابێتەوە کە سەبارەت بە ئاینی مەسیحی دەکرێن، بێ شك لەوانەیە پرسیاری تر ئێستا لەلات دروست بووبێت کەمن لێرەدا باسم نەکردووە، بۆنموونە لەوانەیە بڵێیت: ئایا پێشکەوتن و ئاشکراکردنە زانستییەکان لەگەڵ باوەڕی مەسیحیدا

---

[189] (ئەوەی هیچ چاوێك نەی بینیوە، هیچ گوێیەك نەیبیستووە و بە بیری مرۆڤدا نەهاتووە، ئەوەی خودا ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەی خۆشیان دەوێت.) ﴿پەیمانی کۆن/ئیشایا **4/64**﴾ _ئەمە نموونەیەکە لە پەیمانی کۆن کە لە پەیمانی نوێدا هێنراوەتەوە_ ﴿یەکەم کۆرنسۆس**2/9**تا**10**﴾

[190] ﴿ئاشکراکردن**21/8**تا**9**﴾

[191] (دڵنیان و بە باشتری دەزانین، لە لەش دوور بکەوینەوە و لەلای عیسای خاوەنشکۆ نیشتەجێ بین...) ﴿دووەم کۆرنسۆس**5/8**تا**9**﴾

[192] ﴿فیلیپی**1/23**تا**24**﴾

دژیەکی و جیاوازی هەیە یاخود نا؟ بە هیچ شێوەیەك دژیەکی بوونی نییە لە نێوان ئاشکراکردنەکانی زانست و بیروباوەڕی مەسیحیدا.

خودا سەرچاوەی هەموو هەقیقەتەکانە، جا ئەم هەقیقەتانە لە کتێبی پیرۆزدا بن یان سروشت، جیاوازی نییە و هەر لە خوداوەیە، لە نێوان زانستی ڕاستەقینە و ئیمانی ڕاستەقینەدا هیچ جۆرە دژیەکی و جیاوازییەك بوونی نییە.

هەندێك لە زانا تازەکان، و زۆربەی زانا کۆنەکانیش، لە باوەڕدارانی ڕاستەقینەی مەسیحیەت بوون. زانایان، سەرسوڕهێنییەکانی ئەم جیهانە سەرسوڕهێنە، هەرچەند زیاتر ئاشکرا بکەن ئێمە باشتر دەتوانین بە گەورەی و دانایی و دەسەڵاتی خودا، کە ئافرێنەر و پارێزەری هەموو شتێکە لە بەدیهێنراوەکان، هەست پێ بکەین و پەی پێ بەرین.

یان لەوانەیە ئێوە، وەکو زۆرێك لە خەڵکی، لە نێو کێشە و گێر و گرفتی جەنگ و هەژاری و نایەکسانی لە ژیانێکی سەختدا ڕەنج بکێشن و بپرسن: بۆچی خودا مۆڵەت دەدات کە ئەم تاوانکاریانە لە دونیادا ڕووبدات؟

وەڵامێك کە کتێبی پیرۆز بە ئێمەی دەداتەوە ئەوەیە کە هەموو ئەم تاوانکاری و گوناهکارییانە بەهۆی مرۆڤی تاوانبار و خوا نەناسەوە ئەنجام دەدرێت نەك بەهۆی خودای پیرۆز و گەورەوە. خودا تەنانەت ئێستا خەڵکی بەهۆی تاوان و گوناهەکانیانەوە سزا دەدات. لە کۆتایدا، بەو شێوەیەی کە پێشتر باسمان کرد، خواوەند هەر کەسێك بە پێی کردەوەکانی دادگای دەکات و ئەم جیهانە لەژێر چاودێری خودادا بەڕێوە دەچێت و ئەو ئاگاداری هەموو شتێکە.

خوداوەند هەموو لایەکمان پیرۆزبکات لەئاشتی و ئارامیدا بن هەمیشە...ئامین